# نووسەری کورد

## گۆڤاری یەکێتیی نووسەرانی کورد

ژمارە ( ١٢ ) ، خولی دووەم ، ئابی ١٩٨٣

سەرۆکی نووسین

د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ

سکرتێری نووسین

مومتاز حەیدەری

بارەگای گۆڤار

بغداد ـ الوزيرية

مقابل كلية التربية الرياضية ـ مقر جمعية الثقافة الكردية

چاپخانەی الحوادث.

# بــۆ ئــەم ژمارەیەشــ

**سەرنووسەر**

پیرەمێرد ، هەر ساڵێکی تازەی تەمەنی گۆڤاری ( گەلاوێژ ) ئەهات، قەڵەمی بۆ نووسینی « ساڵنامەی گەلاوێژ » دەخستەکار • لە ڕۆژی خۆیدا، هەر لەسەر لاپەڕەکانی ( گەلاوێژ ) یشدا دەنگی وا هەبوو ، کە ڕەخنە لەو ووشە ڕەنگینانەی پیرەمێرد بگرێت ، بەڵام ئێستا کە دەچینەوە ســەر ئــەو ووشانە ، دەبینین چەند پارچەی ڕەنگینی پەخشانی کوردیمان بۆ ماوەتەوە•

ئەمە شتێکە لە لاپەڕەی یادگارو مێژووی ئەدەبیات • ئەوەی کە بــۆ بەراوردی ئەمڕۆمان ئەشێت ، ئەوەیە ــ کە ئەوسا ساڵی جارێك ، بیر لــە ووشەی تازە دەکرایەوەو ساڵەکەی « گەلاوێژ » یش دوانزە ژمــارەی تەواوی تێدەکەوت • بەڵام وا ئێمە ژمارە بە ژمــارە ، بیر لــە داڕشــتنی ووشەیەکی تازە دەکەینەوەو زۆر جار نێــوان هــەر ژمارەیەو ئەویتر ساڵێکی پێدەچێت • هەروەك هەموو جاریکیش دووبارەی دەکەینەوە ، وەباڵی دوواکەوتنی گۆڤارەکە ناکەوێتە ئەستۆی بەڕێوەبەرانو نووسەرانی گۆڤارەکە ، یا نووسەران بەگشتی ، بەڵکو ئــەو هــەڵو مــەرجانەی لــە ژمارەکانی پێشوودا باسمان کردوون ، جــار دووای جار خراپتر دەبنــە کۆسپ لە ڕێگەی بەڕێکی دەرچوونی گۆڤارەکەدا • ئەمە بێجگە لەوەی کە هەموو جار ، وا بۆ سێ ساڵ دەچێت ، تارمایی پێشینی نەمانی گۆڤارەکە

لەگەڵ سەرەنجامی یەکێتیی نووسەرانی کورددا ساردی دەکردینەوەو هەمووجارێك وامان دەزانی کە ئەمە دووا ژمارەی « نووسەری کورد » بێت • بەڵام هەر تروسکەیەکی تازە دەردەکەوت ، ئێمەش خۆمان گورج دەکردەوەو تینمان دەدایە خۆمانو بەرەو دەرکردنی ژمارەیەکی تازە کۆرمان ئەبەستەوەو کە ئاوڕیشمان ئەدایەوە ، دەماندی پشتمان بەتینە ، پشتمان هەموو نووسەرو شاعیرانی کوردە ، بەتایبەتی هەستی بەرزو یارمەتیی لقی سلیمانیی یەکێتیی نووسەرانو لقی هەولێریش تینی تازەیان پێدەبەخشین •

هەر پاش ژمارەی یانزەی خولی دووەمیش ، لقی سلیمانی ، کە لە ئەمانەتی گشتیی لاوانو ڕۆشنبیرییەوە یارمەتیی ئەوانو لقی هەولێرو دهۆکیش درابوو و شتێك پارەیان لا کۆبووبۆوە بە کۆمەکێکی تازەی ئەوان بناغەی دەرکردنی ژمارەی تازەمان دامەزراندو کەوتینە کۆکرنەوەی قەرزوقۆڵەی فرۆشراوی ژمارەکانی پێشووو کەرەسەی ئەم ژمارەیەمان ئامادەکرد بەڵام لەپڕ کۆسپێکیتر هاتە ڕێگە • ئەویش ئەوەبوو کە یەکێتیی نووسەرانو ئەدیبانی عیراق ـ کە لە ژمارەی پێشوودا بەدرێژی باسی پێوەندیی نێوان خۆمانو ئەوانمان کرد ـ بریاری بەستنی یەکەم کۆنگرەو هەڵبژاردنی ئەنجومەنی مەرکەزییان دا کە لە ڕۆژی ١٩٨٣/٦/١٧ دا بوو •

وەك لە ژمارەکانی پێشوودا دیارە، بەستنی کۆنگرەی ئەو یەکێتییە ـ نەمانی یەکێتیی نووسەرانی کوردی لەدووایەو دەبێ قەوارەی نووسەرانی کورد قاڵبێکیتر بگرێت • واتە ببێ بە لقو بکەوێتە ئەو قاڵبەوە کە لە ژمارەی پێشوودا باسمانکرد • جا مایەوە سەر ئەوەی لەناو ئەو یەکێتییو پێوەندییەدا گۆڤاری کوردیی « نووسەری کورد » حاڵی چی دەبێتو چۆنو کەیو لەکوێ دەردەچێ •

زۆربەی ئەندامانی ئەنجومەنی مەرکەزیی ئەو یەکێتییە ڕایان وابوو کە بە دروست‌بوونی یەکێتیی تازەو نەمانی یەکێتییە کۆنەکان ، ئیتر گۆڤارە کۆنەکانی یەکێتییە پێشووەکان مافی دەرچوونیان نامێنێو دەبێ داوای ئیمتیازی گۆڤاری تازە بکرێت • لەبەرئەوە هەر لەسەر داوای ئێمە، لە یەکەم کۆبوونەوەی بیرۆ ( مەکتەب ) ی تەنفیزیی یەکێتییەکەدا داوای بەخشینی ئیمتیازی چوار گۆڤار کراکە یەکێکیان هەر بە ناوی ـ نووسەری کورد ـ ەوەیە کە « بیرۆی ڕۆشنبیریی کوردی » ی یەکێتی دەری‌بکاتو سەرنووسەری گۆڤارەکە ، هەر سەرنووسەرەکەی خۆی بێت •

دیارە بەخشینی ئیمتیاز چەند کۆسپی لە ڕێگەدایە ، بەتایبەتی زامن‌بوونی یارمەتیی دەرچوون لەلایەن کاربەدەستانەوە ، بەڵام وا ئێمە ژمارەیەکمان لە هەموو ڕووەوە ئامادەی چاپە • داوامانکرد کە ڕێگەی ئەو ژمارەیە بدرێتو ئەویش لەسەر خولی دووەمی گۆڤارەکە حساب بکرێت • وا ئەو ڕێگەیەمان دراو ئێمەو ئێوەش چاومان بە ژمارە دوانزەی خولی دووەمیش ڕوون‌بۆوەو ئەمەش هەر بانگو سەڵاواتەکەی پیرەمێردی دەوێت •

بۆ خولی سێیەمی گۆڤارەکەش ، ئەگەر تاقە پەڵپی ئیمتیاز نەدانو دەرنەچوون باری دارایی یەکێتیی تازە بێت ، ئەوا هەر لەئێستاوە ڕووئەکەینە هەموو خوێنەرانی « نووسەری کورد » ، ڕووئەکەینە لاوان ، ڕووئەکەینە ئەو هەموو قوتابیو کارگارو فەرمانبەرە بچووکانەی پشتی یەکێتیی نوسەرانی کوردو گۆڤارەکەیان گرتبوو ، کە تینێکی‌تر بدەنە خۆیان تا گۆڤارەکە بژێنن •

گۆڤاری « نووسەری کورد » تاقە گۆڤارە لە عیراقدا کە ئەوانەی تێیدا

دەنووسن پاداشی نووسینیان نەویستووەو کەسیش لەوانـەی گۆڤارەکـە دەردەکەن ، ئەگەر لەپێناوی گۆڤارەکەدا پارەی خۆشیان خەرجنەکردبێ، هیچیان لەڕووی مادییەوە لە گۆڤارەکە دەستنەکەوتووە •

ئێمە ئامادەین خولی سێیەمی گۆڤارەکە بەوچەشنە دەست پێبکەین‌و جێگەی « نووسەری کورد » لە ڕێڕەوی ووشەی پاك‌و سـەر بـە کوردو مرۆڤدا لەجێی خۆیدا بپارێزین • هەقی ئەوەشمان هەیە ، داوای بەردەوامیی پشتگرتن لە ئێوەش بکەین •

هیوادارین ، ئەمجارەش بەیەك‌بگەینەوەو ئەمە دووا ژمـارە نەبێت‌و ئاوابوونی ئەستـێرەیەکی‌تری گەشی ئاسـمانی ڕۆژنامەگـەریی کـوردی نەبێت •

مەدینەی مولکی بابان « موخلیسا » یەعنی سولەیمانی

کە جێی دوو حەزرەتی‌وا بێ ، ئەبێ وەك کەعبەتوڵلا بێ

# نامەیەکی پڕ لە سۆز بۆ « نووسەری کورد »
# لە یەکێك لە قوتابی‌یانی سانەویی کچانەوە لە هەولێر

بە ناوی خـوا

**هەرچەند ئەکەم ئەو خەیاڵەی پێی مەستم**
**بۆم ناخرێتە ناو چوارچێوەی هەڵبەستم**

بۆ ئەندامە بەڕێزەکانی گۆڤاری نووسەری کورد

وا لە فەرهەنگی کچە کوردێکەوە ، ئەم چەند دێڕە لاپەڕەی سپیی ڕەش‌کردەوە •• جا نازانـم دەتوانم ئـەوەی لە دڵمایە دەربـڕم یا نـا ؟ هەرچەند بنووسم ناتوانم بگەمە ئاستی چیای بەرهەمی جـوان‌و پـیرۆزی ئەندامانی ئەم گۆڤارە • ئەوەی ئەمەوێ بیڵێم ئەوەیە کە بەڕاستی جێگای باوەڕو ڕێزو خۆشەویستیی هەموو کوردێـکن • بەڵـێ هەوڵـدانتان ، ماندووبوونتان ، بەرهەمە جوان‌و هەڵقوڵاوەکانی خاك‌و چیا وا دەرئەخەن• بۆیە گۆڤارەکەتان لای من‌و زوربەی خوێنەرانی کورد بووەتە پیرۆزترین کتێب • لە کاتی خوێندنەوەی هەر بابەتێك‌و هـەر شیعرێـکی هەست بـە نزیکیی ئێوە دەکەین • هەست ئەکەین کەوا ئاگاداری هەست‌و نەست‌و تاڵ‌و شیرینی خاك‌و میللەتن • خۆزگە ئەمانتوانی شتێکی‌وا بکەین بتوانین یارمەتی بەردەوامی‌و پێشکەوتنی ئەم گۆڤـارە ئازیزەمـان بـدەین • گـەر

لەتوانادا بوایە خوێنی خۆمان ئەکردە مەرەکەبی بۆ چاپ کردنی ژمارەیەك لەو گۆڤارە پڕنرخ و پیرۆزە •

لە کۆتاییی ئەم نووسراوەدا بە ناوی هەموو کیژۆلە کوردەکانــــی دواناوەندیی هەولێری کچانەوە هیوای سەرکەوتن و ، هەروەها پیرۆزباییتان لێ دەکەم بەبۆنەی ئەو سەرکەوتنەی کە بە دەستتان هێناوە لە دەرهێنانــی گۆڤارەکەتان •

بۆ پێشەوە !

**قوتابی : نازەنین شوانی**
**دواناوەندیی هەولێری کچان**

---

سەد شەهەنشــاهو پادشـا مــردن
سەیری کە کــوردی ئێمــە هەر کــوردن

میللەتە باقی ، مابەقا فانی
هەر لە جافی هەتا بــەگۆرانی

حەسرەتم هەر ئەمە لە دنیادا
( حاجی ) دەمرێ بە دەوریان ناگــا

گەر بە دەورانیان بگەیبایــە
هەمو حاڵی دەبوون چ دەریایە

**حاجی قادری کۆیی**

---

# دڵدارو شیعری ڕیالیزم

**کەریم شارەزا**

**ریالیزم لە ئەدەبدا چی‌یە ؟**

ریالیزم لە ئەدەبدا دەربڕینێکی هونەری‌یە ، هەر نووسەرو ڕەخنەگرە بە جۆرێك لێ‌یەوە دەدوێن‌و ، چەشنە بیرو ڕایەکیان بەرامبەری هەیە ، لە هەندێ سەرچاوەدا بەم‌جۆرەی خوارەوە پێناسە دەکرێ‌و دەڵێن :ـ « ریالیزم لە ئەدەبدا ئەوەیە هەموو شتێك چۆن دێتە بەرچاوو ، لە چ بارو وێنەیێکدا بێ بەوجۆرە دەربخرێ ، بە بێ‌ئەوەی لە دەریای ئایدیالیزم (١) و ئەندێشەدا بخنکێنرێ » (٢) •

لەبارەی ئەدەبی رێبازی ریالیزمەوە شاعیری پێشکەوتنخوازی تورك « نازم حیکمەت » دەڵێ :ـ « ریالیزم رووبارێکی گەورەیە ، گەلێ جۆگەلەو ووردە رووباری دێتەوە سەر ، لەوانەیە جاری‌وایش هەبێ ، هەندێ لەو جۆگەلەو ووردە رووبارانە راستەوخۆ تێکەڵاوی نەبن‌و بە تەنیشتی‌دا بڕۆن‌و ، لەوانەشە جوانتر خۆیان لەبەر تیشکی رۆژدا بنوێنن‌و، باشتر بدرەوشێنەوە ، بەڵام لەئەنجامدا هەر تێکەڵی رووبارە گەورەکەی ریالیزم دەبنەوەو بەردەوام هەندێ لەو ووردە رێبازانە دیاردەیێکی وەختی بن‌و خۆیان بخەنەوە سەر رێگەی ریالیزم‌و ، بەم‌پێ‌یەش ئەو رێبازە تا

دێ قووڵترو فراوانتر دەبێو سوود لە هەموو ئەو ووردە تاقی کردنەوانە وەدەگرێ » (٣) •

زۆر جاریوایش هەیە ئێمە لە خوێندنەوەی پێناسـەکانی ریالیزمو ووردبوونەوە لە بابـەتـەکانی ، دەگەینە ئـەو راسـتییەی کـە بڵێین : « ئەدەبی ریالیزم بابەتەکانی لە ژیانی گشتی کۆمەڵ گەلەوە وەردەگرێو لە گیرو گرفتەکانییـەوە دەدوێ • ئەمەش بەرەو ئەو قەناعەتەمان دەبات کە بڵێین : « ئەدەبی ریالیزمی لە گیرو گرفتـەکانی کۆمـەڵو دیاردەکانی کلۆڵیو هەژاری ئەو کۆمەڵـگایەوە دەدوێ کە چینە زەحمەتکیشەکانی میللەت لەژێریاندا دەناڵن ، بۆئەوەی جەماوەری میللەت هوشیار بکاتەوەو بەرەو چارەسەرکردنی گیرو گرفتەکانی ژیانیان ببات » (٤) •

ئەم پێناسەکردنو لێدوانەی شیعری ریالیزم بەرەو لقێکی سەرەکی یاخود بڵێین رێبازێکی نوێترمان دەبات کە رێبازی ریالیزمی سۆشیالیستییە کە دەڵێ :ـ « هونەر ـ کە ئەدەب لقێکییـەتی ـ چەکـێکە لە مەیـدانی خەباتی چینایەتیداو دەبێ لە پێناوی بەرپاکردنی شۆڕشێك بەکاربێتو ، وەك سامانێکی میللی پێشکەشـ بە چینی کارگـەران بکرێت ، چونکـە هونەر ـ ئەدەب ـ بۆ میللەتەو پێویسـتە بەجۆرێـکیوا بێ کە میللـەت تێیبگات » (٥) •

**دڵدارو شیعری ریالیزم :ـ**

هەرکەسێکی کەمێـك ئاگاداری تێکۆشـانی گـەلی کـورد بـێو شارەزاییێکی لە کاروانی شیعری نوێی کوردیدا هەبێو ناوی « دڵدار »ی شاعیری پێشکەوتنخوازی کـورد ( ١٩١٨ ـ ١٩٤٨ )ی بێتـە بەرگوێ ، یەکسەر هەڵبەستە ناودارەکەی « ئـەی رەقیب » ی وەکـوو سرووشی

خەباتی نەتەوەیی کورد لە سەردەمێکی مێژوویی ناسك لە گوێدا دەزرنگێتەوە و لاپەڕەیەکی گەشی لە مێژووی تێکۆشانی نەتەوەکەی لە سەردەمی « کۆماری دیموکراتی مەهاباد » ی ساڵی ١٩٤٦ دا دێتەوە بەرچاو ، کە چۆن ئەو هەڵبەستەی دڵدار بووبوو بە سروودی نیشتمانیی نەتەوەی کورد •

دوای ئەو هەڵچوونە نەتەوەیی‌یەی کورد لە سەردەمی ئەو کۆمارە کۆرپەلە ساوایەی مەهابادو ، رووخاندنی لەلایەن رژێمی ئێرانەوەو بەپێی بارو هەڵوێستی سیاسی دڵدار خۆی گۆرانێکی سەرەکی بەسەر هەڵوێستی ئایدیۆلۆژی‌و ئەدەبی‌دا هات بەتایبەتی لە ساڵی ( ١٩٤٦ ) ەوە ، کە خووی دایە زۆر خوێندنەوەی کتێبی فەلسەفەو زانستو ئەدەبی نوێی گەلان • حەزی‌دەکرد لە هەموو زانستو هونەرو فەلسەفەیەکدا زانیارییێکی تەواوو فراوانی ببێ • بۆیە دڵدار : « لەو رۆشنبیرانە بوو کە خۆیان خۆیانیان فێردەکردو پێ‌دەگەیاند ، چونکە لەو سەردەمەدا دامودەزگای ئەدەبی لە وولاتدا نەبووو ، پیشەی پارێزەریش هۆیەکی گەورە بوو پێی بچێتە بنج‌و بناوانی ژیانی هەژارانەوە » (٦) • تا وای‌لێ‌هات بتوانین بڵێین : « دڵدار نەك تەنیا شاعیریکی خاوەن بیروباوەڕیکی نەتەوەیی پێشکەوتنخواز بوو ، بەڵکوو تێکۆشەرێك بووە لە ڕیزی تێکۆشەرانی زەحمەتکیش ، بۆیە جێگایێکی تایبەتی لە رێڕەوی تێکۆشانی گەلی کورد بەتایبەتی‌و سەرتاپای گەلی عیراق بە گشتی‌دا هەیە » (٧) •

دڵدار سرووشی هونەری شیعری کوردیی لەو سەرچاوانەوە وەردەگرت‌و دەسی‌دایە شیعری چینایەتی دانانو ، پشتگیریی کردنی چەوساوەکان • باشترین نموونەی بەرچاویش لەو چەوساوانە ، چینی جوتیاران بوو ، بە چەند هەڵبەستێکی دوورو درێژی وەکوو « لالەباس »و

« تووتنەوان » (٨) هەڵوێستی خۆی بەرامبەر دەر دەبڕینو کردنی بە دوو نموونەی بەرهەمی شیعری ڕیالیزمی لە ئەدەبی کوردیدا •

وەنەبێ دڵدار لەخۆیەوە کەوتبێتـە سـەر ئەو ڕێبـازە ئـەدەبیيە نوێیەی ، بەڵکوو دەبێ ئەو ڕاستیيە بزانین کە « لەپاش جەنگی دووەمی جیهانو لەدوای ڕمانی فاشزمو سەرکەوتنی بەرەی میللەتانو ئازادبوونی نەتەوە ژێردەستەکان ڕاپەرینێکی سیاسی لە پێناوی سەربەستیدا ، هەموو کونجێکی ئەم دنیایەی گرتەوە • ئەدەبیش بەشێکی جودانەکراوەیـە لە ژیانی ئادەمیزاددا ، بەو پێیە ئەویش دەگۆڕێو ، لەوکاتەوە بەرگـێکی ریالیزمی بەسەردا هات » (٩) •

دڵداری شاعیری ریالیست جگە لە سروودە ناودارەکەی « ئـەی رەقیب » کۆمەڵە هەڵبەستێکی ریالیزمی لە گۆشەی هەمان بیرو باوەڕی ناو شیعرەکەی « ئەی رەقیب » ی وەکوو « کوردستان » و « ئەی لاو » و «کوترە باریکە» و « لاوی کورد » داناو دوابە دوای ئەمانەش کەوتەسەر شیعری چینایەتی دانانو لێدوان لە ژیانی هەژارانو چەند نموونەیێـکی وەکوو هەڵبەستەکانی « لالەباسـ » و « توتنـەوان » و « نامەیـەك » ی پێشکـێش بە کاروانی شیعری نوێی کوردی کرد •

**چەند شیعرێکی ریالیزمی دڵدارو هەڵسەنگاندنێکی خێرا :-**

بەرلەوەی بکەوینە هەڵسەنگاندنی چـەند نموونەیێـکی شـیعری ریالیزمی دڵدار ، وا ڕاستە جۆری ئەو ریالیزمەی دەستنیشـان بکەین کە شیعری پێ داناوە ، ئایا ریالیزمی رەخنەیی شۆرشگێڕیی بووە یاخود ریالیزمی سۆشیالیستی ؟ ! •

ئەوەی ڕاستی بێ دڵدار لە سەرەتای چلەکاندا چەنـد شـیعرێکی

ریالیزمی شۆڕشگیڕیی داناو لەدواییدا لەگەڵ گۆڕانی هەڵویستی سیاسی لە پاش جەنگی دووەمی جیهاندا ویستی بەرەو ریالیزمی سۆشیالیستی بچێو شیعر بۆ بەرژەوەندیی چینی چەوساوە دابنێ ، بەلام ئەمجۆرە ریالیزمەی دەستیدایە ، ریالیزمێکی فۆتۆگرافی بوو و ، « خۆی لەسەر زمانی خوێندەوارە پێشکەوتووەکان دەنواندو بریتیی‌یە لە پیشاندانی ناگزووریو دواکەوتوویی کۆمەڵ بە شێوەیێکی ساکاری سەرپێیانە » (١٠) .

ئێمە لەوکاتەی کە دڵدار وەك شاعیرێکی گەورەو نوێخواز سەیر دەکەین ، ئەو ساکاریو سەرپێیی‌یەی ریالیزمی فۆتۆگرافی لێ دەگرینو دەڵێین دەبوایە بەوجۆرە ساکارە سەیری مەسەلەکانی نەکردایەو کەمێ رەگەزی خەیاڵو ئەندێشەی قووڵی رۆمانسییانەی خستبایە پاڵ ، چونکە هەندێ ئەدیبی گەورەی وەك مەکسیم گۆرکی (١٨٦٨ - ١٩٣٦) و کۆمۆجۆی چینی سوورن لەسەر ئەو ڕایەی‌کە نووسەرو شاعیری گەورە دەبێ ڕۆمانسی‌یەتو ریالیزم لە بەرهەمەکەیدا کۆبکاتەوە ، تاکوو بەرهەمێکی بەهێزو پتەویان لێ دروست بکات » (١١) .

کەچی دەبینین دڵدار لە هەڵبەستە ریالیستەکانی تەنیا جۆری فۆتۆگرافی گرتووە ، هەروەك لە هەڵبەستەکەی « لالەباس » دا کردوویەتی ، وەك وێنە کێشێکی لێ هاتووە زۆر بەووردی تابۆی ئەدگاری جوتیارێکی کلۆڵی ڕووتو تێكشکاومان بۆدەکێشێو دەڵێ :ـ

**رۆژێکی پاییز لەپاش نیوەڕۆ**
**لالە باسم دی زەوی ئەدا تــۆ**
**رووتو زگ والا ، پییرو تێكشکاو**
**پشتی چەماوە ، لووت لەسەر ئەژنۆ**

**گۆچانی دەستی دەستەندووی جووت بوو**
**دەنگی نووسابوو بە هێ هێو هۆ هۆ (١٢)**

دوای ئەو وێنەکێشانە فۆتۆگرافیەی دیمەنو ئەدگاری «لالەباس»ی پیری تێکشکاو ، شاعیر دێتە سەر باسی زولمو زۆرداری ئاغای دەرەبەگ ، کە لە رێگەی کوێخاکەیەوە لەو جوتیارە کلۆلە کراوەو دەڵێ :ـ

**ووتی : لە هاوین کوێخا کاکەسوور**
**هاتە ماڵەوە پێیووتم :ـ لالـۆ**
**شایەدی بدە « زەوی زێرین‌دۆل »**
**ئەوا هی منەو قورئانیش بخـۆ ٠**
**ووتم : کاکەسوور بەم سەرو ریشە**
**ئۆباڵی خەڵقی ناخەمە ئەستۆ**
**ووتی : هەروەها بە سەری ئاغا**
**ئەتکەمە پۆری بەر چەنگی هەڵۆ**
**بۆ شەو زەلامی هەنارده سەرم**
**ماڵیان دامە بەر شبێلینگی برنۆ (١٣)**
**سێ مانگام هەبوو بە تالانی برد**
**منالی هێشتم بە بێ ماستو دۆ ! (١٤)**

بەم‌پێیە دڵداری شاعیری ریبازی ریالیزم زۆر بەووردیو وەستایانە هەموو دیمەنێکی ئەو کارەساتە تراژیدی‌یە دەردەبڕێو هەموو زۆڵمو زۆری ئاغای دەرەبەگ بۆ میللەت دەردەخاتو ئەوەشمان بۆ روون‌دەکاتەوە کە ئەنجامو پاداشتی ئەو هەموو ئەرکو ماندووبوونەی ( لالە ) ی جوتیار ، تەنیا تیکە نانەجۆیێکی بێ‌بێ‌خۆرو بێ‌دۆیەو شاعیر لەسەر هەڵبەستەکەی دەڕواتو دەڵێ :ـ

ئەوا چل ساڵە زەوی دەکێڵم
ئەلاحی دەکەم هەتاکوو ئەمڕۆ
نرخی ئارەقەی ڕوونی ماندوویيم
تیکە نانێکە چ نان ؟ نانەجۆ
ئەویــش بــە بێ دۆ (١٥)

ئەم هەڵبەستەی دڵدار شیعرێکی ریالیزمــی فۆتۆگرافی‌یــە ، وەك بڵێی کامیرایێکی گرتۆتە دەستو واقیعی رەنگو رووی ژیانی «لالۆ»ی جوتیاری هەژاری کلۆڵی بۆ گرتووین ، بە بێ‌ئەوەی هەوڵێکی‌دابێ بۆ دیوی ناوەوەی مەسەلەکەی ئەو هەژاری‌و چەوساندنەوەیە شۆڕ ببێتەوەو، هەندێ جــووڵەو کــرداری دەروونی‌و چارەسەرکردنــی گــیروگرفتی چەوساندنەوەو لەناوبردنی دەرەبەگایەتیمان بۆ دەستنیشان بکات • تەنیا ئەوە نەبــێ لە شوێــنێك هەســت بــەو شــۆڕبوونەوەیەو بە مەسەلــە دەروونی‌یەکەی دەکرێت ، ئەویش لــەم تاکە دێــڕە شیعرەیــدا خۆی دەنوێنێ کە دەڵێ :ـ

ئاگری دڵی لە هەردوو چاوی
بڵێسەی ئەدا وەك جووتێ پشکۆ ! (١٦)

لەم جۆرە شیعرە ریالیزمیانەی دڵدار نموونەیێکی دیکەمان بەرچاو دەکەوێت ، ئەویش هەڵبەستە دوورو درێژەکەی « توتنەوان » ە • ئەم نموونەیەشی وەك نموونەکەی « لالەباس » تەنیا وێنەکێشانی دیمەنەکانی دەرەوەی ژیانو گوزەرانی کرێکارێکی کشتوکاڵی‌یە ، کە بووە بــە ( توتنەوان ) لەلای کوێخایێــکی وەکیلی ئاغــای زۆرداری دەرەبەگو بازرگانی پارەداری ناوبازاڕی شار ، کە کوێخا بۆ بەرژەوەندی خۆی‌و ئاغاکانی ئەو توتنەوانە زەحمەتکێشەی چەوساندۆتەوە ، بــە بێ‌ئەوەی

شاعیرمان تروسکەیێك لە رووناکایی چارەکردنو رزگار کردنیمان بۆ دەربڕێ • جا ئەو چارەکردنو جوولانەوە رزگاریخوازی‌یە ، لە وێنەی کریکارێکی تێکۆشەر یاخود جوتیارێکی تێگەیشتووی سەر بە کۆمەڵو رێکخراوی جەماوەریی سەردەمی پاشایەتی بۆگەن بۆ (لالەباس)و کابرای « توتنەوان » بڕەخسێنێو پشتگیریان بکاتو رێگەی رزگاریان لەچنگ زۆرداریو چەوساندنەوەی ئاغاو کوێخای داردەستی بۆ بدۆزێتەوە •

دڵدار وەك لەمەوبەر گوتمان واقیعێکی فۆتۆگرافی توتنەوانەکەمان بۆ دەردەبڕێ « کە بەوپەڕی کەساسیو پەڕپووتی دیمەنی ( عەولا )ی توتنەوانمان بۆ دەکێشی ، ئەو توتنەوانەی کە دەیبینی لەبەر ئیشی گرانو سەختو ژیانی تاریكو ناخۆش » (١٧) بەم شێوەیە دێتە بەرچاو هەروەك شاعیر ئەوەمان بۆ دەردەبڕێو دەڵێ :ـ

**زەردو بێهێزو لاوازو نەخۆش**
**ماڵوێران ، پەڕپووت ، بەدەم لەرزوتا ! (١٨)**

ئینجا شاعیری ریالیستمان دێتە سەر وێنەکێشانی جێگەو ماڵو پێویستی‌یەکانی ژیانی « ئەم توتنەوانە بێ پشتیوانەی کە لە دەشتێکی چۆڵ ، کەپرێکی شڕو وڕی پێکەوەناوەو ، هەندێ قاپی کۆنو ڕەش داگەڕاوی لەژێر کۆکردۆتەوە ، گوایە ماڵێکی پێکەوەناوەو دەژی • بەڵێ ئەم دەژیو ئاغاش دەژی !! کە لە کوشکێکی بەرزو لەناو بەرگی پۆشتەو پەرداخو لەسەر خۆشترین خۆراك دەلەوەڕێ ، ئەمەش هەمووی لەکوێ؟! بێگومان لەسەر حیسابی ئەم تووتنەوانەی کە لەم کەپرەدا دەژی • • » (١٩) •

دڵدار بەمجۆرە لە کەپرەکەی مام عەولای تووتنەوانی هەزار

دەدوێو زۆر بەووردی وەسفی کەلو پەلەکەی ئەو ماڵە پەرپووتە دەکاتو دەڵـێ : ـ

**کەپرێکی دارگەز ، نارێك دامەزراو**
**بە پووشو گەڵای چروو سەرگیراو**
**بۆ پارێزگاری خۆرەتاوو تۆز**
**بە چیخێکی شڕ سێ دەورە گیراو**
**ناوماڵی ئاودێر (٢٠) هەرزاڵەیی چووك (٢١)**
**دوو پارچە بەڕی شڕو هەڵزڕاو !**
**جەرەیێکی کۆن ، سێ گۆزەی کەرخیو**
**چەن هامانی رەش ، جامێکی قوپاو**
**سێڵێکی تەنك ، خوانەیێ بچووك**
**لەولاش مەنجەڵێك سەرنخوون کراو**
**دوو لێفی شڕی چلکنی کون کون**
**سێ پیالەی چاو ، قوریەکی شکاو ٠ (٢٢)**

ئەمە هەموو ناوماڵو کەلوپەلی ژیانی « عەولا »ی توتنەوانەو مایەی گوزەرانو بەرێوەچوونی ئەو هەژارەیە ٠ ئەگەر بێینەسەر روخساروکێشی شیعرەکانو هەیکەلی هەڵبەستەکەش ، دەبینین بابەتەکە لە حەوت بەنـد پێكهاتووەو هەموو بەندەکانیشی لەسەر کێشی ١٠ برگەیی ( ٥ + ٥ )ی خۆماڵی کوردی‌یە ، بەڵام هـەر بەنـدی لەســەر جـۆرە سـەروایێك دەڕوات ، شاعیر خۆی وەکوو چاودێرێك ژیـانو گوزەرانـی توتنەوانو کردارو رەوشتی کوێخای وەکیلی ئاغاو بازرگانەکانی ناوشار دەردەخات ٠ بەبێ‌ئەوەی وەك هەڵبەستەکەی « لالەباس » شاعیر دەمەتەقێو ووتووێژی خۆی تێکەڵ بە گفتۆگۆی « توتنەوان »ی هـەژارو کوێخـای چەوسێنەری

فیڵباز بـکات‌و گیانێـکی درامـی‌و جموجۆڵـی ئاوێتـەی ئـەو شیعرەی بکات •• » (٢٣)

شاعیری ووردبینمان ئەگەر بەشداریشی لـە مشتومڕی دەمەتـەقێی ( کوێخاو مـەلاو توتنـەوان )ی هـەژاردا نەکردبـێ‌و دەوری پشتیوان‌و رزگارکەری ئەو کلۆڵەی نەدی‌بێ ، ئەوەندە هەیە زۆر وەستایانە دەستی لەسەر لایەنی چەوساندنەوەو زۆرلێکراوی تووتنەوانـی دانـاوەو وەك کامیراێکی تەلەفزیۆنی حاڵی ئەو هەژارە بێدەرەتانەو رەوشتی کوێخـاو مەلای حیسابگری لەو گفتوگۆیەی نێوانیانـدا وێنەکێشـاوەو بە ڕاستی‌و بەتەواوی بۆ هەمـوو کەسـێکی دەردەبـڕێ‌و ، لەسـەر زاری کابـرای توتنەوانەوە دەڵێ : ــ

**ئینصافت هەبێ ، سەیری حاڵم کە**
**رەوشتت چۆنە ؟ چۆن منت هێنا ؟!**
**هەتا ئیقناعت کردم بە ئاودێر**
**خۆت کردە نۆکەر من بووم بە ئاغا**
**کە هاتم زگم کەوتە سەرزەوی**
**تووتنم چاندو رەنجی شانم دا**
**ئەڵێم دار بکرە ، ئەڵێم داو بێنە**
**ئەڵێم برسیمە ، ئەڵێی پارە کوا ؟**
**من بە بێ‌پارەو منداڵم برسی**
**لە کوێ قوڕ بێنم بیکەم بەسەرما (٢٤)**

ئینجا ( دڵدار )ی شاعیری ( ریالیزمی فۆتۆگرافی ) وەستایانە ئەو دیمەنە ووردانە دەردەبڕێ کە چۆن مەلای مـیرزای کوێخا بە خەتــە ناشیرینەکەی حیسابی خـوارداشی بۆ مـام( عەولای تووتنەوان ) لەسەر

فەرمانی کوێخاکەی کە لە دەفتەرێکی پەرپووتی پرفرپوفێڵ تۆمار کردووەو دەڵێ : ـ

**مەلا دەفتەری لە باغەڵ دەرکرد**
**دەفتەر چ دەفتەر ؟ پەرپووتو گەچڵاو !**
**ئەرقامی زل زل خەتی خوارو خێچ**
**ئیملا فارسی بە کوردی نووسراو**
**ئەمدی پەڕێکی بێفێڵ نووسرابێ**
**ئەمدی ووشەیەك ساغو ئەڕنراو ! (٢٥)**

کە مەلای میرزای کوێخا دەکەوێتە سەر حیساب خوێندنەوەی عەولای هەژار ، « دڵدار دەری‌دەخا کە ئەم حیسابە چجۆرە حیسابێکە ؟ چ‌رۆژە رەش‌و ماڵ‌خواردنێکە ؟! چ‌جۆرە خوین‌مژین‌و سەر پان‌کردنەوەیێکە ؟ حیسابێکی‌وای کە فڕی بەسەر راستی‌یەوە نی‌یە ••• بە ئارەزووی دەرەبەگ قەڵەمە پووچەکەی مەلای حیسابگر لەسەر ئەم کاغەزە شڕە خراوەتەکار ، هەر بۆ ئەوەی ١٢٠ دیناری لەسەر بکەن بە ماڵو » (٢٦) دەڵێ : ـ

**ووتی : مام عەولا ئەمە حیسابتە**
**پەنجاوشەش دینار لە دەستی کوێخا •**
**سیی دینار گاجووت چواریش کەرەستە**
**بیستو پێنج دینار کەرەستەو ئەشیا**
**دوو دینار جارێك ، سێ دیناری‌کەش**
**لە منت وەرگرت لە ماڵی ئاغا**
**جەمعی سەدوبیست دینارە تەمام**
**بەگویرەی دەفتەر « صەحیحە » وەڵلا • (٢٧)**

مردنی کتوپڕیی دڵداری شاعیری جوانەمەرگ ماوەی نەدا تاکوو ئەم هەڵبەستە درێژەی تووتنەوان تەواوبکات ، تاکوو بزانین چچارەیێکی بۆ ئازادبوونی چینی زەحمەتکیش لە چنگی زوڵمو چەوساندنەوەی ئاغاو پارەداری ناوشارو مام کوێخای وەکیلیان دادەنێ ؟

چونکە شیعری ریالیزم هەر دیمەنو دەردی ئابووریو کۆمەڵایەتی دەربڕین نییە ، بەڵکوو لەپاڵ ئەمانەدا پیشاندانی ریگەی ئازادبوونو چارەسەرکردنی گیروگرفتەکەش ، بەشێکی جودا نەکراوەیە لە مەسەلەکە •

خوێندەواری بەرێز •• ئەمەلێکۆڵینەوەیێکی خێرا بوو لەسەر دڵدارو شیعری ریالیزمی کوردی • هیوادارم توانیبێتم رووناکییەك بخەمە سەر ئەو لایەنەی شاعیرییەتی دڵدارو هەڵوێستی سیاسیو ئەدەبی شاعیری ریالیزمی کوردمان لەنیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا بەتایبەتی لە چلەکاندا ، کە تازە ریالیزم وەك رێبازێکی ئەدەبی لە شیعری کوردیدا سەری هەڵدەدا •

**پەراوێز**

(١) ئایدیالیزم : میثالییەت •

(٢) الموسوعة العربية الميسرة ـ ط ٢ ، القاهرة ١٩٧٢ ، ص ١٩٤٠ •

(٣) د• عزالدين مصطفى رسول ـ الواقعية في الأدب الكردي ـ بيروت ١٩٦٦ ص ١٠٦ •

(٤) د• محمد مندور ـ الأدب ومذاهبه ـ القاهرة ١٩٥٧ ، ص ٨٢ •

(٥) د• احسان عباس ـ فن الشعر ـ بيروت ١٩٥٩ ، ص ١٢٦ ، ١٢٧ •

(٦) د٠ مارف خەزنەدار ـ گۆڤاری کولێجی ئەدەبیات ـ ژمارە (٢٠ ـ ٢١) بەغدا ١٩٧٧، ٩، ١٠ ٠

(٧) مومتاز حەیدەری ـ دەفتەری کوردەواری ـ ژمارە (٢) بەغدا ١٩٧٠ ل : ١٣٠، ١٣١ ٠

(٨) مەرگ ماوەی ( دلدار ) ی نەدا هەڵبەستەکەی ( تووتنـەوان ) تەواوبکات ٠

(٩) عەزیز گەردی ـ گۆڤاری هەولێر ژمارە ( ٤ ، ٥ ) ساڵی ١٩٧١ ، ل : ٢٥ ٠

(١٠) د٠ مارف خەزنەدار ـ سەرچاوەی پێشوو ل : ٢٠ ٠

(١١) د٠ محمد مندور ـ فن الشعر ـ القاهرة ، ص ٥٤ ٠

(١٢) دیوانی دڵدار ـ چ ٢ ـ هەولێر ١٩٧١ ، ل : ٥٦ ٠

(١٣) بڕنۆ یاخود بڕنەو : جۆرە تفەنگێکی چیکی‌یە ، لەسەردەمی ژیانی دڵداردا باشترین تفەنگ بوو ٠

(١٤) دیوانی دڵدار ـ ل : ٥٧ ٠

(١٥) هەمان سەرچاوە ، ل : ٥٨ ٠

(١٦) هەمان سەرچاوە ، ل : ٥٦ ٠

(١٧) عەزیز گەردی سەرچاوەی پێشوو ل : ٢٦ ٠

(١٨) دیوانی دڵدار ـ ل : ٢٦ ٠

(١٩) عەزیز گەردی ـ سەرچاوەی پێشوو ، ل : ٢٦ ٠

(٢٠) ئاودێر : هەرچەندە بەپێی مانای فەرهەنگی بەو کەسە دەگوترێ کە کشتوکاڵ ئاودەدات ، بەڵام لە مەڵبەندی بیتووین‌و رانیـە بـە مانای ( تووتن چێن : تووتنەوان ) دێ •

(٢١) هەرزاڵە : کەپرێکی نزمە •

(٢٢) دیوانی دڵدار ـ ل : ٦٥ ، ٦٦ •

(٢٣) کاکەی فەللاح ـ کاروانی شیعری نوێی کوردی ـ ب ١ ، بەغـدا ١٩٧٨ ، ل : ١١٦ •

(٢٤) دیوانی دڵدار ل : ٧٠ •

(٢٥) هەمان سەرچاوە ، ل : ٧٢ •

(٢٦) عەزیز گەردی ـ سەرچاوەی پێشوو ، ل : ٢٧ •

(٢٧) دیوانی دڵدار ـ ، ل : ٧٣ •

# له یه‌که‌م سه‌فه‌ردا ..

شێرکۆ بێکه‌س

-١

وه‌ختێ خۆم‌و جانتای سه‌وزی
مارکه‌ی سه‌ر پشتێن « موسلاوی »
له ئه‌سته‌موول ...
که دابه‌زین‌و ڕاوه‌ستاین .
له دره‌خت‌و بنچکێکی لاڕێ ئه‌چووین
هه‌ردووکمان هه‌ر :
قژ خۆڵاوی
شان‌و مل ته‌پ‌و تو

★ ★ ★

وا دوو ڕۆژه
له‌لای ئه‌م شاره چاوشینه
لامان‌داوه
که هه‌ر ئه‌ڵێی

شۆڕەژنێکە کراس سەوز ،
ڕاکشاوە ..
بالیفی ژێرسەری کەژەو
قاچی سپیش لە « بسفۆڕ » دا
وەك مەڕمەڕی بەر هەتاوە .

★ ★ ★

ئەم شارە برۆی پەیوەستی
سەرچاوانی شین و ڕەشی
هەردوو شۆخی
ئەوروپایەو ئاسیایە ..
کە ئەیبینی تێئەپەڕێ :
جارێك قۆڵ ڕووت و کراس کورت ،
جارێکی دی کراسێکی ئاودامانی
لەبەردایە .

★ ★ ★

وا دوو ڕۆژە چاوی نامۆم
هەر وەکوو دوو کۆترە شینکە
هەتا ئیستە باڵ بەستراو بن .
گرێی باڵیانم کردەوەو .
ئەوەتا وا دەمێ بۆ سەر
گوومەزی شین و خلیسکی
بریقەدار هەڵئەفڕن و
دەمێکی تر قژو بسکی

« منەوەری » ئەستەموولی
ئەکەن بە هێلانەی شیعرو
ئارامێکی تێدا ئەگرن .

* * *

کە بەلای دیواری کۆنی مەرمەڕینی
مزگەوتێکی کلاوقووچدا گوزەرئەکەم
بۆنی کەواو سەڵتەو .. بۆنی ،
پشتێنەکەو ، کلاوەکەی نالی ئەکەم .
کە دەس ئەدەم
لە مۆردی پەرژینی باخێ
دەسم بۆنی ڕیشی ئەگرێ !
کە شەپۆلی سەرهەڵگ[illegible] توو
پەڕەی گوڵی هەڵ[illegible] ..
دووکەڵی هەر دو[illegible]ەل کێشێ ..
کە منداڵانی هەژاری
وەك کارژۆلەی پەرەوازە ..
خەوتوو لە بن سێبەری پرد ،
چەتری پاسدا .. بەدی ئەکەم ،
من بۆن ئەکەم ..
بۆنی بۆکرووزی شیعری
ئاوارەبووی نالی ئەکەم !

* * *

ئیستە بەناو گۆڕستانی « ئۆسکۆدار » دا

ئەگەرپێمو چاوم وەکوو هەڵاڵەی سیس •
چڵی مل •• کەوتوو بەلادا •
هەڵهێنانەوەی هەنگاوی خاوی پەستیم
بەناو دارستانی سپیی بەردەکێلدا
ورد •• ورد ئەمبا •
گەورەم نالی !
ئەی نارەوەنە تەنیاکەی
هەڵکەنراوی خانەقاکەی
سلەیمانی !
تۆ لەکوێدا ••
چڵوچێوی ڕاکشاوی ؟!
مورىدێکی شیعری خۆتم •
هۆرەیەکی « خاكوخۆڵ » تم •
هاتووم بۆ لات •
گەورەم نالی !
ئەی تانجەرۆی سەرگەردانو
سیروانی وێڵ !
ئەی ئەستێرەی ڕاونراوی کوردستانم !
شارێك گۆڕو •• بێشەیەك کێل
کێ ئەزانێ لە کام گۆڕدا ••
تۆ ئێسقانی ڕاکشاوی ؟!
گـۆڕت بزر
بزر وەکوو ساڵو ڕۆژی
لەدایكبوونی هەزاران

ئەڕواتو دێ ••
تا ئەو ئەزێو
تا ئەوان تاقەتیان ئەچێ •
یان ناوبەناو
هەر سێبەریان بۆ ئەکاتو
وەڕس نابێو
بەدیاریانەوە ئەوەستێ ••
وەك شاعیر بەدیار وشەوە
زەوی بەدیار پرووشەوە
چرا بەدیار ••
عاشقێکی بێدارەوە
هەزاران بەدیار کارەوە •
منیش ئیستا
هەنگـێکم شیلەی لێوی
ئەم بسفۆڕە باڵی گرتووم
هەرچەند ئەمەوێ هەڵفڕم
هەڵنافڕمو هەتا ئیستا
لە جێگەی خۆم
هیچ نەبزووتووم !

★ ★ ★

لە گوێ بسفۆڕ دانیشتوومو
قۆڵی کراس هەتا ئانیشك ،
پانتۆڵ تا ئەژنۆ هەڵـکراو

هەردوو قاچم
خستۆتە ناو
ئاوی تەنکاو
ئیستە لە تیترواسك ئەچم
تیترواسکێ نامۆو بێجووت
چەند ڕۆژێکە ••
هەر خۆی‌و خۆی ••
بە سێبەری کەنارێکی دەس‌تەزیوا
بە هەتاوی بەستێنێکی
سنگ بەرەڵلای
ئارەقی لاجانگ نەسڕیوا ••
هەر خۆی‌و خۆی نامۆو بێجووت
بەسەر ڕۆخی داوێن تەڕا ••
نزم •• نزم بەقەد باڵای
خەمی نەمام
هەڵئەفڕێت‌و ، ئینجا بەرز
لەناو تەمی
نیوە داپۆشیوی شاخا
ون‌ئەبێت‌و لەدواییدا ••
هەر خۆی‌و خۆی نامۆو بێجووت ••
ئەگاتە لای بەفری نووستووی
سەر هەڵەموت •

* * *

لەگوێ بسفۆڕ ڕاکشاوم
هەردوو دەستم لە ژێرسەرا
ئێستە ئەڵێی هێرۆیەکی
سەرلق سپیم
لە دوورەوە ئاو هێناومی‌و
ئاو لایداوم •
وەکوو هێلکە شەیتانۆکەی سەر لم
چاوم نووقاو •
وەك شۆڕەبی دانەویوی
گوێ‌گرتووو لە •• گۆرانیی ئاو
گوێم گرتووە :
ئەڵێی هاژە ناوم‌دێنێ !
کەنار لای‌لایەم بۆئەکا !
گەرداوی دوور بانگم‌ئەکا !
سەر هەڵئەبڕم ••
تۆزێکی‌تر هەڵئەسم‌و بەم‌ڕۆخەدا
ڕێگەی ئاونگاوی ئەگرم •
ئەڕۆم •• هەورازی سەربەگوڵ •
دەشتی قززەرد •
گردۆڵکەو هەردی ڕووت‌وقووت
هەمووی ئەبڕم •
ئەڕۆم •• ئەچم ••
لە کوڵکێشی پاپۆڕەکان ••
لە بێ‌کاری بەندەرەکان ••

پرسیار ئەکەم ••
ئەڕۆم « شەفیقی تۆڕنەچی » ئەبینمەوە
لێی ئەپرسم ••
تا بەلەمە سەوڵسوورە
چاوشینەکەی « نازم حیکمەت »
ئەدۆزمەوەو سواری ئەبم •
ئەوسا ئیتر هەردوو سەوڵم
ئەبن بە دوو باڵی درێژ
ئەمبەنە لای شەپۆلی دوور
ئەمبەنە لای ئەو گەرداوەی
بانگی کردم ••
ئەمبەنە لای ماسیگرێ
کە هەروەکو خۆم تەنیایە
بەڵام ئاواتی چاوسەوزی
وەکوو بسفۆڕ لەدڵیایە •

**سلێمانی .ـ ١٩٨٣**

# شانۆ هەر زیندوو دەبێت (*)

عومەر عەلی ئەمین

« ئەمشەو شەش ملیۆن کەس وان لە سینەما ، لە چل ملیۆن پتریش گوێ لە ڕادیۆ دەگرن ، پتر لە هەشتا ملیۆن کەسیش سەیری تەلەفزیۆن دەکەن ، بەڵام ژمارەی ئەوانەی سەیری شانۆی درامایی پیشەیی ( محترف ) دەکەن ؛ لە حەفتاویەك هەزار کەس تێناپەڕێت » •

ئەمە سەرژمێریکی ئایل گرینی نووسەری گۆڤاری فاریتی بوو لە ئەمەریکا لە دیسەمبەری ساڵی ۱۹۵۹ دا • جا لەکاتێکدا ئەم ژمارانەمان لە بەرچاو بێتو بمانەوێت کتێبێك دەربارەی شانۆ دابنێین ؛ وەك ئەوە وایە کە لەم سەردەمی هاتووچۆ کردنی مانگەدا ، کتێبێك دەربارەی ئەسپێکی تیژڕەو دابنێین •

بەڵێ ، شانۆ ئەگەر هەر بۆ ڕابواردن بوایە ، ئەمە ڕاستبوو • بەڵام شانۆی چاك لە سنوری ڕابواردن دەچێتە دەرەوە ، بەڵکو لە سەردەمە مەزنەکانیدا نووسەرو نوێنەرو دەرهێنەکانی ، ئەمانیش هەر بە هەمان گەرمیو دڵسۆزی زاناو خاوەنبیرو فەیلەسوفە گەورەکانەوە ، تێکۆشاون بۆ دۆزینەوەی مانای بوون ( وجود )و لایەنە جوانەکانی ،

★ بۆ نووسینی ئەم وتارە کەڵك لە بەشی یەکەمی کتێبی ( المدخل الی الفنون المسرحیة )ی ( فرانك م • هوایتنگ ) وەرگیراوە •

چونکە جەوهەری شانۆ پشت بەو زانستیە گشتیە دەبەستێت کە : مرۆڤ توانای دۆزینەوەو سەرسوورهێنانو هیواخوازی هەیە •

ئێمە زوربەی ژیانمان بە شتی پڕوپوچو ڕەوشت، خووی باوو چاولێکەری‌یەکی کوێرانەوە دەبەینەسەر ، بەڵام هێندێ‌جار کە بەتەنیا لەبەر ڕووناکی مانگەشەوێکی خامۆشدا بەسەر گردێکەو، دادەنیشین ، یان کە لەناو دارستانێکی دامێن گۆمێکدا ، لە سەوزایی‌یەکی گوێ کانی‌یەکی لاپاڵ چیایەکدا ، یان لای منداڵێکی نەخۆش دادەنیشین ••؛ لەم کاتەدا ئەو ڕەوشتو خووە باوانەو ئەو شتە پڕوپوچانەی ژیانمان لەبیردەچێتەوەو ، هەستێکی وورایی ئەوتۆ دامان‌دەگرێ کە کارێکی‌وا دەکات هەست بە مانای بوونو لایەنە جوانەکانی بوون بکەین • دە هونەری مەزن بایەخ بەم کورتە کاتانە دەداتو ئەم کورتە کاتانەی مەبەستە • جا ئێمەش لەم چەند دێڕەدا بەشێوەیەك لە شانۆ دەدوێین کە لەپێش هەموو شتێکەوە هونەر بێت •

دەربارەی شانۆ گەلێ‌جۆر بیروڕای پێچەوانە هەیە • شانۆ لای ئەغریقیەکان دەستورێکی ئاینی بوەو هەڵکەوتووترین ژیر ە کۆمەڵدا خۆی تەرخان‌کردووە بۆ خزمەت‌کردنی • لای ڕۆمانەکان وەك ڕابواردنێکی هەرزان وابووە کە کۆیلەکان پێشکەشی گەورەکانیان کردووە • بەڵام بەلای کەنیسەشەوە لە سەرەتادا خراپە بوەو وەك دزێتی پێویستی بە ڕەگ‌و ریشە دەرهێنان بووە ، هەرچەندە دووای چەند ساڵێك هەر کەنیسە خۆی وای‌لێ‌هات شانۆگەریی نهێنیەکانو موعجزەکانی ، وەك دەستورێکی ئاینی گرتە باوەش • لای هێندێکیش شانۆ هەر بۆ کات‌بردنەسەر بووە • لای هێندێکی‌کەش هەر لە سەردەمی نوێنەرە گەڕۆکەکانەوە هەتا سەردەمی نوێنەری پێکەنین‌جاڕی لە تەلەفزیۆن ؛

ڕێبازێك بووە بۆ خۆژیاندن •

بەڵام لەگەڵ ئەم هەموو بیروڕا جیاوازانەشدا ، شانۆ هێشتا لای نووسەرە مەزنەکان ڕێبازێك بووە یاریدەیداون بۆ دۆزینەوەی مانای ژیانو نهێنیەکانی بوون • هێندی باوکیش شانۆ بە بەڵایەك دەزانن بۆ شەخسیەتو دەروونی ئەو منداڵانەی کە هۆگری دەبن ، بەڵام زوربەی زانایانی پەروەردەو دەروونناسان ؛ شانۆ بە دەرمانێکی بەکار دەزانن بۆ چاككردنەوەی زوربەی ئەو نەخۆشیەیە شەخسیانە •

جا لەکاتێکدا کە ووشەی شانۆ ئەوەندە فراوانو بەرین بێتو ، ئاوا بەمشێوەیەش هەمەجۆر بیروڕای پێچەوانەی تێئاڵابێت ، بێگومان بەر پلاری هەڵەو هەڵەکاری دەکەوێتو بیروڕایواشی دەربارە پەیدا دەبێت کە گوایە شانۆ بەرەو نەمان دەچێت •

ئەگەر مەبەست لەمڕایە شانۆی بازرگانی بێت ؛ ڕەنگە لە ڕاستییەوە دوور نەبێت • لە سەرێکیکەشەوە ئەگەر مەبەست لە شانۆ بەرهەمی سینەماو ڕادیۆو تەلەفزیۆن بێت ؛ ئەمە ئەمڕۆ لە هەموو کاتێکیکەی گەشاوەترە • بەڵام ئەگەر مەبەست تەنیا بەرهەمە ڕەوا درامایییە پیشەییەکان خۆی بێت ؛ هەستدەکەین کە تەندروستی شانۆ تەواو نییە بەتایبەتی لەڕووی مادیەوە • بەڵام لەمداراتەشدا ڕاستییەکی بەهێزو جوان خۆی جێگیر کردووە ئەویش ئەوەیە کە : شانۆی درامایی لە ماوەی ئەم دووهەزارو پێنجسەد ساڵەدا دەستێکی باڵای لە پێگەیشتنی شارستانێتیدا هەبووە • جا هێندێك لەوانەی کە باوەڕیان تەنیا هەر بەو شتانەی سەردەمی خۆیان هەیە ، ئەوانە کە سەیری ئەو تەمەنە درێژەی شانۆ دەکەن ؛ بە شتێکی کۆنەی دادەنێن • بەڵام شارەزایانو شانۆناسان ، کەلەپوری شانۆ بە شایستەی ڕێزێکی گەورە دەزانن •

شارستانێتی بەرهەمی تەنیا یەك نەوە نی‌یە ، بەڵکو بەرهەمێــکی کۆکراوەی هەموو کۆمەڵو هەموو سەدەکانە • مرۆڤێك ئەگەر هەر لە لەدایك‌بوونیەوە بەرەڵا بکرێت بەتەنیا گەورە بێت ، مرۆڤێکی پەك‌کەوتەو نەزانی لێ دەردەچێت ، بەڵام کە لەناو کۆمەڵدا ژیاو گەورە بوو ، ئەو کەلەپورە زۆرو زەبەندەیەی ڕابـوردوو ؛ فـێری زانـین، شارستانێتی دەکاتو دەیکاتە مرۆڤێکی کارامەو لێهاتوو • ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئێمە قەرزارێکی زۆری پێشینانین •

هەروەها شانۆش هەر بەم‌پێ‌ودانــە • بەڵــێ هەرچــەندە سینەماو ڕادیۆو تەلەفزیۆن نوێ‌کاری‌یەکی زۆریان هێناوەتە کایەوە ؛ بەڵام لە زۆر جاردا هەر پشتیان بە ڕابوردوو بەستووە • کاروباری هەڵچواندن‌و، سۆزجوڵاندن‌و هێنانە پێکەنین‌و هێنانە گریان ، کەمێك نەبێ ! نەگۆڕاوە ، هەتا لەگەڵ بلیمەتیی مرۆڤی ئەم سەردەمەشدا ، زوربەی شانۆگەری‌یە مەزنەکان ، ئەوانەن کە لە سەردەمێ کۆندا نووسراون •

گوڵزاری جوانــی شانۆی ئــەم سەردەمــە زادەی خۆڕاکــی لەو ڕەگانەوە هەڵمژیوە کە لە زەمینــەی ئــەو ڕۆژگارە دێرینانــەدا بنجیان داکوتاوە کە قەدەکانیان بارستایی دووهەزارو پێنج‌سەد ساڵیان سمیوەو خۆیان گەیاندۆتە مرۆڤی ئەم سەردەمە • جا ئاغری‌و سەنگین‌و گرانی‌و دوورەپەرێزیی لە بایی‌بوونــەوە کە ئەمانــە مەرجــە ناونیشانــی هەموو هونەرمەندێك‌و هونەرمەندی شانۆش بــن ، ئەمانــە لەئەنجامــی زانین‌و ڕێزلێنانی ڕابوردووەوە دروست دەبن • کەچی هێندێك نوێنەر یان دەرهێنەر یان نووسەر کە لە یەکەم جاریاندا سەرکەوتنێك بە خۆیانەوە دەبینن ، ئیتر دەبنە نیچیری لەخۆبایی‌بوونێك وادەزانن کە تائێستا هەموو ئــەم جیهانە نوێنەرێك یان دەرهێنێك یان نووسەرێکی کەی وەکو ئەوانـــی

بەخۆیەوە نەدیوە • بەڵام ئەو هونەرمەندانەی کە لەمێژووە درێژەکەی شانۆ شارەزان‌و زەنگی کاروانە دووهەزارو پێنج‌سەد ساڵیەکەی دەبیستن ؛ ئەوانە هەر لەخۆیان دێت کە چۆن بە سەنگینی‌و هێمنی‌و ڕێزو دڵسۆزی‌یەوە لە بەردەم هاڕەی چەپڵەی ڕەزامەندی جەماوەردا ڕادەوەستن •

بەڵام دەرخستنی ئەم ڕاستی‌یەش نابێ ئەوە بگەیەنێت کە شانۆ هەرچی‌یەکی هەیە گوایا هەمووی دەستکەوتی ڕابوردووە ، نەخێر ، بەڵکو چەندان‌جار گەیشتۆتە سەرەلوتکەی شاکاریی کە ئەمەش بەم مەزنترین دەستکەوتی مرۆڤایەتی دادەنرێت •

[ لەوانەیە نەتەوەیەك دەوڵەتێکی چاکی هەبێت‌و خاوەنی هێزێکی گەورە بێت‌و هیچ نیشانەیەکی هەژاریی پێوە دیار نەبێت ، بەڵام ئەگەر لە وێژەو مۆسیقاو بیناسازی‌و هونەری شێوەکاریدا خاوەنی هونەرێکی تایبەتی خۆی نەبێت ؛ لەوانەیە خۆری مێژووی لێ ئاوا بێت بە بێ‌ئەوەی لە تۆمارێکی ڕامیاری باش بەولاوە هیچی‌کەی لەپاش بەجێ‌بمێنێت • ـ بوس تارنگتون ـ ] ئەمەریکا بەم هەموو سامان‌و جرت‌وفرت‌و هێزە سەربازی‌و مادی‌یەوە کە هەیەتی ، تووشی ئەم دەردە بووە ، مەگەر لەم‌دوواییی‌یەدا نەبێ کەوا خەریکە پێ‌بنێتە جیهانی ڕۆشنبیری‌یەوە •

بەم‌بۆنەیەوە با ئەوەمان لەیادبێت کە ڕۆما کاتی خۆی لە زوربەی لایەنەکانی ئێستای ئەمەریکا گەلێك پێشکەوتووتر بوو : ئەندازیاری پلیمەت ، هێزێکی گەورەی سەربازی ، خەزنەی پڕ پول‌و پارەی لە ژمارە نەهاتوو ، شەڕەدەنووکی گەرمی نێوان سیاسەت‌پیاوان ، دەسەڵاتێکی پێنج‌سەد ساڵیی بەسەر جیهانی ڕۆژئاوادا ، حەوزی مەلەو

خوانە ڕازاوەکانیشیان شانی لە شانی هینەکانی ئیستای هۆلیۆد دەدا • کەچی لەگەڵ ئەم هەموو چەتەوڵیتیەیدا ؛ ئەو بەرهەمە بەنرخانەی کە لەپاشی بەجیٚما ، زۆر کەمتر بوو لە بەرهەمە مەزنە بەجیٚماوەکانی شارە بچووکەکەی ئەسینا کە لە ناوچەیەکی تەنگەبەردا دەسەلاتی لە سەدە سالیش تیٚنەپەڕی • بۆنموونە : شانۆگەرییەکی وەکو ( ئۆدیب بە پاشایی ) کە بەرهەمیٚکی ئەغریقیەکانە ؛ لە زۆر جاردا هەموو ووتارو کردارەکانی ئەنجومەنی پیرانی ڕۆمانی دادەپۆشیٚت • ئەو ڕۆمایەش بەو مەزنییەی خۆیەوە ئەگەر بەرهەمی هیٚندیٚ ئەندازیاری، بیناسازیی و پەیکەرتاش و شاعیرو فەیلەسوفی سەردەمەکانی سەرەتای لەپاش بەجیٚنەمایە ، ئیٚستا ئەو ناوبانگەی جیٚگەی داخ دەبوو •

[ نە شانۆو نە هیچ هونەریٚکی کە وەك کەژاوەیەکی ڕازاوە ، یان شتیٚکی مادیی کە نییە • کەژاوە کۆن دەبیٚت و فڕیدەدریٚت ، ئوتومبیل پەکیدەکەویٚت و فرمانی تەواو دەبیٚت و هیچ نرخیٚکی نامیٚنیٚت ، بەلام هونەر ، هونەری مەزن ، جەوهەرەکەی ؛ نەمرە • چونکە شتی جوان بەدریٚژایی زەمانە خۆشی دەبەخشیٚت •

— شاعیری ڕۆمانسیی ئنگلیزی : کیتس — ]

هونەر لە سنوری زەمانەو لە سنوری جیٚگا دەچیٚتە دەر ،وەو لەودیو پەردەی ڕەگەزو باوەڕو نەتەوایەتیەوە خۆی ناشاریٚتەوە ، هەر بەهۆی تەلیسمەکەشیەوەیەتی کە هەتا ئیٚستاش ئیٚمە هاوبەشی بەرهەمەکانی سۆفۆکلیس و شکسپیرو گۆتەو سترنبورگ دەکەین • شانۆگەریی ( ژیانی تەروادە ) یان ( لیزیستراتا ) لەپیٚش دووهەزارو پیٚنجسەد سالدا لای دانیشتووانی ئەسیناو ئیسپارتە چماناو مەبەستیٚکی هەبوو ، ؛ ئیٚستاش لای دەوڵەتە شەڕکەرەکان هەر هەمان ماناو مەبەست دەبەخشیٚت •

شانۆگەریی ( ئەلیکترا ) یان ( مەلیك لیر ) وەك باشترین شانۆگەریی سەردەمی خۆی ، بە هەمان ڕەسەنیو قووڵی‌یەکەی جارانیەوە جەمەوەری ئیستای شانۆ ڕادەپەڕێنێ •

ڕوواڵەتی زیانی مادی دەگۆڕێتو کۆن دەبێو بەجێدەمێنێت ، بەڵام جەوهەری ناقی‌کردنەوەکانی بەشەر وەك گوڕی لاوێتی ، دڵداریی ••• هتد ئەمانە کەلەپورێکی مرۆڤایەتی گشتی هەمو خەڵکینو لە هەموو زەمانێکدا •

بە بێ‌مشتومڕ لەسەرئەوەی کە کام هونەر لەوانی‌کە مەزنترە ، ئەوە دەخەینەوە یاد کە شانۆ لە دوو ڕووەوە پەسەندیی بەدی‌دەهێنێت : ڕووی جوانیی‌و ، ڕووی بیر •

لە ڕووی جوانی‌یەوە ، شانۆش وەکو مۆسیقاو سەماو وێنە لەپڕکردنەوەی بێویستیەکانی سۆزی مرۆڤدا بەشداری دەکاتو لە هەموو جوانی‌یەکیش مرۆڤ تێردەکات • لەڕووی بیریشەوە ، قاڵبی دراما بەشێکی زۆر گەورە لە مەزنترین ئەو بیرو باوەڕانە دەردەبڕێت کە عەقڵی مرۆڤ تەقاندوێتیەوە ، لیستەی ناوی ئەو فەیلەسوفانەی کە لە مێژووی شانۆدا دەچریسکێنەوە باشترین بەڵگەیەبۆ ئەم ڕاستی‌یە • وەك لیدرسون، ئەسخیلۆس ، گۆتە ، ئەبسن ، شۆ ، شوبنهاور ، نیتشە ، دیوی ••• هتد ، کەچی لەگەڵ ئەمەشدا زۆر سەیرە کە دەبینین هێندێ‌کەس گوێچکەی منداڵەکانیان ڕادەکێشن کە نەچن بەلای شانۆدا : بەلای بیرو فەلسەفەو ئەدەبی چریسکاوەدا •

[ ئەوەی کە چاوەڕوان نەدەکرا ، هێشتا زوربەی شانۆی پیشەیی زیندوو هەر پایەدارەو هیچ کەمو کووڕیەکی تیدا نی‌یە ، بگرە لە سالانی ١٩٠٠ ـ ١٩٢٩شی بەرزترە ، جونکە کەم‌بوونەوەی ژمارەی

شانۆگەرییەکان بە شێوەیەکی گشتی کاری کردۆتە سەر بەرزبوونەوەی ڕادەی دەقەکان •

هەرچۆنێك بێت شانۆ ، کارتێکردنی خۆی بەسەر هەموو هونەرە دراماییەکانیدا دەسەپێنێو لە سنوری قەبارەو بەودای خۆی تێدەپەڕێت • بەڵام ئەگەر قەبارەو مەوداکە مەبەست مادە بێت ؛ شانۆی درامایی ڕاستەقینە ، ئەمڕۆ لەسەر شانی نوێنەری زیندوو نییە ، بەڵکو لە ڕادیۆو تەلەفزیۆنو سینەمادایەو پیشەیەکی فراوانەو ملیۆنەها جەماوەری هەیە ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا سەنگی شانۆی پیشەیی نییە ، بەڵکو بە گۆشتو ئێسقانیەوە نیشانەی بازرگانی هەر پێوەیە • بەڵام شانۆی پیشەیی لەسەرو شانۆی بازرگانییەوەیە ، ئەمە لە هەمان کاتدا بازرگانیشەو هونەریشە - پرۆفیسۆر برنارد هیویت - ]

شانۆی درامایی ڕاست ، کە جەماوەرەکەی کەمبوبێتەوە ، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە بەرەو نەمان دەڕوات، بەڵکو شانازییە هونەرییەکەی لەوەدایە ئەوکەسانەی کە لێی کەمبوونەتەوە لەوانەن، سەر بە ڕابواردنن ، یان لەوکەسانەن ڕادەی بیرکردنەوەیان لە ڕادەی تەمەنێکی دوانزە ساڵیدایە ، یان لە پیاوە شەکەتەکانی کارو فرمانن •

[ من دژی ئەو ڕایەم کە دەڵێت شانۆ بەرەو دوواڕۆژێکی تاریك دەڕوات • چونکە شانۆ هێز لە نوێنەرەوە وەردەگرێت ، واتە کاری نوێنەر پێشکەوتنی شانۆ دەسەپێنێت • من دەتوانم ( ٣٠ ) جار بچم بۆ سەیرکردنی نوێنەرێکی کارامە بێئەوەی لێی بێزار بم ، چونکە ئەو نوێنەرە هەر جارە توانای پێشکەش کردنی شتێکی نوێی هەیە ، کە ئەمەش کارێك دەکات شانۆگەریی ڕوواڵەتی نوێنەرەکەی پێوە دیاربێت • نوێنەر لەسەر شانۆ کە دەبینێت من وەك سەیرکەرێك سەیر دەکەم ، ئەمە

دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەو ؟ ... ەر دروست بکات • بەڵام سینەما لەم مەیدانەدا کۆڵە ، ناتوانێت کارێکی وا بکات هەست بە جۆشی دڵمان بکەین ـ نووسەری شانۆو شاعیرو ڕەخنەگری ڕوسی ئەلەکسەندەر گلادکۆف ـ ]

[ شانۆگەریی لەخۆیدا بریتیە لە دەنگدانەوەیەکی نزمی ئەو هەستانەی کە لەدیوی ناوەوەدان ، نوێنەریش کەسێکی ئەوتۆیە دەتوانێت ئەو جۆشانەمان لای خۆی گل بداتەوە ، ئەمەش کارێکی وا دەکات کە فرمانەکەی خۆی بە دروستکردن دروستبکات ـ گۆتە ـ ] •
[ ئەگەر دڵی نوێنەر لەسەر شانۆ لێبداتو فرمێسك بێتە خوارەوەو چاو بگری ، پێبەپێی ئەو ئازارو بەختیارییەی ئەو ، سەیرکەریش بەگەرمی دڵی لێبدات ؛ ئەوسا شانۆ نامرێت ـ ئەلەکسەندەر گلادکۆف ـ ]

بەرزترین ناونیشانەی درامای ڕاستی ، ئەو هۆگرییەیە کە لەنێوان نیشاندانو سەیرکەراندا هەیە ، چونکە لە شانۆدا لە یەككاتدا لە دووسەری بەرانبەرەوە کاری چێژکردنو خواردن هەیە : لە نوێنەرەوە بۆ جەماوەرو لە جەماوەرەوە بۆ نوێنەر کە ئەمەش دەبێتە هۆی دروستبوونی نیشاندانێکی شاکار • نوێنەری زیندو و شانۆ ؛ یاریدەیەکە بۆ بەشداریکردن لە کاری تاقیکردنەوەکاندا کە لە هیچ مەودایەکی ئالەتکاریدا ئەمە نایەتەدی ، ئا ئەمەیە جەوهەری هونەر •

عونسوری ڕاهاتنو هۆگریی لەنێوان نیشاندانو سەیرکەراندا کە پێویستە برەوی پێ بدرێت ؛ تەنیا عونسورێکی گرنگە کە شانۆی ڕەوا ( شرعی ) لە بەربەرەکانێ کەرەکانی جیا دەکاتەوە • شانۆی ڕەوا بەپێی توانا باشترین ڕاهێنان پێشکەشی نوێنەر دەکات ، هیچ شتێکیش وەك

قۆستنەوە لەلایەن جەماوەرەوە ، نوێنەر فـێری ووردترین عونسوری هونەری ناکات • هەروەها شانۆی ڕەوای جێگیر بەپێی چێژو پێویستی جەماوەرەکەی خۆی ، دەقی شانۆیی هەڵدەبژێرێت ، جـا بەم‌پێیەش لەوانەیە شانۆگەری‌یەکی سترنبرگ لە زانکۆیەکدا کە بایەخ بە وێژەی ئەسکەندیناوی دەدات ؛ جەماوەرێـکی زۆری هەبێـت ، بـەڵام ئەگەر پێشکەش بە جەماوەرێکی ئاسایی سینەما بـکرێت ؛ دەکەوێـت • یــان شانۆگەریی (لیزیستراتا) لای جەماوەرێکی هوشیار کە لە چرنووکـە تیژە گاڵتەجاری‌یەکانی ئەریستوفانیس تێدەگات دژ بە شەڕ ، بەلایـەوە لە ڕادەیەکی تەڕوبڕو بەرزدایە ، بەڵام لای جەماوەرێـکی ئاسایی زۆر نزم‌و بێبایەخە •

شانۆی ڕەوا لە تاقی‌کردنەوەکانیشیدا لە مونافیسەکانی ئازاتـــرە چونکە کەمیی پارەتێ‌چوونی بەرهەمی شانۆگەریی لەچاو پارەتێ‌چوونی بەرهەمی سینەمادا بەراورد ناکرێت ، لەبەرئەمە لێ‌هاتووەکان ئەم زەمینە لەبارەیان لە بەردەمدا هەیە بۆ تاقی‌کردنەوەکانیان •

بۆ تاقی‌کردنەوەکانیان : لەسەر دەقی چاك ، لەسـەر شـێوەی نوێی نیشان‌دان ، لەسەر قوتابخانەی نوێ ، لەسەر نواندن‌و دەرهێنان ، بە بێ‌ئەوەی تووشی ئەو گیروگرفتە یاسایی‌یەو ئەو چاودێریە ببن کـە لەڕێگەی سینەماو ڕادیۆو تەلەفزیۆندا هەیە ، لەکۆتایـی ئـەم کورتـــە باسـەدا دەڵێـین : شانـۆی ڕەوا بـەهۆی ئـەو مـێژووە دوورودرێـژە ئاشکرایەوەی ، بەهۆی هاوبەشی‌کردنیەوە لە پێشکەش‌کردنی جوانی‌و بیردا ، بەهۆی جەماوەرە تایبەتیەکەی خۆیەوە، بەهۆی ئەو پێوەندی‌یەوە کە جەماوەرو نوێنەری توونـد بەیەکەوە بـەستووە ، بـەهۆی ئـەو زەمینە لەبارەوە کە هەیەتی بۆ تاقی‌کردنەوەی نوێ ، لەبەر ئەم هەموو هۆیانە ؛ تەمەنی شانۆ هەتا هەزاران ساڵی‌کەش هەر درێژ دەبێت •

# شاخی سەرسەختان

**مارف عومەر گول**

بە هیواوە چوومە شاخی سەرسەختانو
شەو لە بەر بای ئازادی‌دا دیدەی پڕ لە ئەشكو ئاخم نایە سەرچۆك
دەستم نایە دەستی هاوڕێ سەرگەرمەكەم
گەردانەی نوێی تەمەنێكی تۆفو تاڵی عاشقانەم دا لە بەرۆك
نەمامێكی كەڵەگەتی خەفەتبار بوو دڵی وێڵم
دڵم‌نایە ڕوو لە خاكی خۆم وەرگێڕم یا جێی‌بێڵم
وتم ڕیشم هەر ناتاشم ، تاكو دڵم تۆزی مەینەت نەتەكێنێ
تا ئاواتی چاوەڕوانی‌و هەنسكی دڵ نەبنە ڕۆژی تریقەی گیان
تا ئێواران هەركەس بۆ لای خۆشەویستی خۆی دێتەوە
من لە خوێنی گەشی مناڵ دەس‌هەڵناگرم
هەتا لەشی تاكو تەنیام ئەم سەردەمە ساردو وشكە جێ نەهێڵێ
هەتا سەرما بەسەرمانا دەواری بێ ، دەبێ لە گەڵ مەرگا بمرم !
بەردبارانە !
لە نیوەڕۆی ولاتمانا چاوەڕوانین كەی مانگ هەڵدێو
ئەستێرە كەی دەجریوێنێ

به نیوەشەو چاوەڕوانین ڕۆژ کەی هەڵدێ‌و ٨
کۆتر کەی بێ بەسەر لانەی ئاوارانا بگمێنێ !
فرمێسك بەسەر گەڵای سووری ڕوومەتمانا دێتە خوارێ !!
بۆچی نابێ مرۆڤ خاکی خۆی خۆش‌بوێ ،
مرۆڤ ماڵی لە بناری شاخی خۆیا ئارام بگرێ !
هەر چاوەڕێم دەس بۆ لووتکەی چیا بەرم ، دارستانی ڕەنگاوڕەنگ بێ
هەر چاوەڕێم لە پێشوازیی کەژاوەکەی سەربەستی‌دا ڕاوەستم‌و
گوڵاڵەی سوور ٠
بەسەر نەوەی ئەم سەردەمە تووڕەیەدا بەشمەوە ٠

* * *

مەگرین ،
خەو لە چاوما ئارام ناگرێ
گەر بزانم ئەم تۆفانە لەکوێوە دێ‌و دەستەوئەژنۆ دابمێنم !
ئەم تەمەنە وەرزی تۆف‌و تاریکی‌یە
بانگیان کردم ٠٠ هاوڕێکانم لەسەرمانا بانگیان کردم
گوێم لێیان بوو ،
نامەیەکم بۆ دایکە چاو کزەکەم بەجێ‌هێشت‌و
وێنەیەکیم لە باخەڵ نا ،
نامەیەکیش بۆ ئەو کچەی بە جێم‌هێشت‌و
وێنەی شاخی سەرسەختانی لە ئەلبۆمی تەمەنی‌دا خستە سەرچاو
لاوێتیی خۆم دایە دەستی بارانەوەو
تا خۆرئاوا چاوەڕێ بووم
لەسەرمانا گەڕام ، ڕام‌کرد

بەدوای خۆری ئەودیو ... ورا گەڕام
پەنجەکانم گشت ڕچیبوون
بەڵام دڵم پڕ پشکۆ بوو .. ئەو ئاگردانەم نەبوایە
نەمدەتوانی بەناو تۆف‌و تاریکی‌یا ڕوو لە شاخی سەرسەختان کەم

* * *

هەستم کەوێکی زامداری شاخاوی‌یە لەبەر سەرمای ئەو شاخەدا
هەڵئەلەرزێ
جاربەجارێ سەر لە هەردی گەرمیان دەدات
جارجارێکیش سەر لە ماڵی گوندان دەدات
ئای پێی خۆشە ڕۆژێ دابێ بەسەر باخی گوڵاڵەدا بفڕێ‌و بڕوات
لە پەرێزو لە خەرمانی سەپانێکی کۆڵنەدەردا
چینەبکاو هیلاکیی خۆی لەبیربکات .
هەستم کەوێکی زامدارەو
ئەو کچەی وا ڕۆژگارێ بوو ڕووی کردبۆ قیبلەی هیوام
ئێستا پرچە نازدارەکەی لە ناو لەپیا پڕوکاوەو
بەدوای قۆڵما عەوداڵ بووە !
قوڵێکم لێم جیابۆتەوە .. بەم دەستەکەم هەڵی‌دەگرم !
نیشتمانم وەك باڵندەی وێرانەماڵ بەسەر قۆڵما هەڵنیشتووە
مرۆڤ بێ‌قۆڵ نە دەتوانێ باوەشی خۆی بۆ ئازیزی بکاتەوە
نە دەشتوانێ لە سەردەمی سەرکەوتنا دەس‌هەڵبڕێ
قۆڵم لە خۆم نابێتەوە !
ئێستا قۆڵم کراسێکی سووری گەشی لەبەردایە

خوڕخوڕ ئەگری •• دەماریشی وا لە کوڵی پێکەنینا
هەرگیز قۆڵم لێم وننابێو لەگەڵمایە •

★ ★ ★

دایکم بە دوو ، چاوی شینو کز کزەوە
بەم ڕۆژگارە بۆم ئەگری
ئیتر مەگرین •• با چاوانی بەو تینەوە کوێر نەبنەوە
ئیتر مەگرین ، دایکم دڵی ڕادەوەستێ
ئای دەردەدڵ چەندە سەختە !
ئیتر بەسە •• دەنگی شۆخە شیرینەکەم دەگاتە لام
دەنگی دۆستو ئازیزانم دەگاتە لام
شەو بوو ڕۆشتم •• بەرەبەیان کات ڕاوەستاو خۆر هەڵنەهات
نەگریامو لە گۆمی زامیان هەڵکێشام
دەوروبەرم وشكو برینگ
زەوی لانەی جاڵجاڵۆکەو مشكو مار بوو
ئەوانەی وا پاچو بێڵیان نابۆ سەر شان
ملی ڕێیان گرتبۆبەر بۆ سەرچاوە
منیش لە گەڵ ئەوانەدا بەڕێوەبووم
ئەگەر باوەڕ بە من ناکەن ،
ئەو کاتەی وا لەتلەت کرام
خوێنم لە خوار گوندێکەوە داڕژایە چەمی وشکی نیشتمانم
ئەگەر باوەڕ بە خۆم ناکەن •• لەو گوندانە پرسیار کەن
لەوکاتەدا ، تاوێ باران بەسەر گیانی سوورما باری
ئەگەر باوەڕ بە خۆم ناکەن •• قۆڵمو گیانی دابێژراوم گەواهیمن

ئەگەر باوەڕ بە خۆم ناکەن .. وەرنە سەیوان
گۆڕی یەکەم ، گۆڕی دووەم ، گۆڕی سێیەم
گۆڕی یەکەم ، ئەوە هاوڕێی دەستە ڕاستمە
گۆڕی دووەم ، ئەوە چاومە ، چاوی ڕاستمە
گۆڕی سێیەم ، ئەوەش خۆمم
لە دوورەوە قۆڵم دیارە سەوز بووەو
وەك ئەرخەوانێکی ترە بەو گردەوە
ئەوانەی وا پاچو بیڵیان هەڵگرتووە
ملی ڕێیان بۆ سەرچاوە هەڵـگرتووە
ئەوان دەڕۆن ،
لە سەردەمی ماندوێتیشدا منیان لەبیرناچێتەوە
جار جار دێنە سەر مەنزڵی ئەرخەوانی سووری قۆڵم
ئەوانە وا لەپاڵ شاخی سەرسەختانا
بنەوانێك بۆ ئەم وەرزە تینوو و وشکە هەڵدەبەستن .

**بەغدا ـ کەرکووك**

**سەرەتای ساڵی ١٩٨١**

# دکتور ئیحسان گوڵەباخێکی ژاکاند

« فەریدون عەلی ئەمین »

لە ژمارە «٦٩»ی « ئاب »ی ساڵی « ١٩٧٨»ی گۆڤاری « روشنبیری نوێ »دا ، دکتور ئیحسان فواد بە سەرناوی « لەو گوڵەباخانەی هەرگیز ناژاکێن »ەوە ، شتێکی لەبارەی « حافیزی شیرازی »یەوە نووسیبوو ، چەند تاکە شیعرێکی یان بە هۆنراوە یان بە پەخشان کردبوون بە کوردی ، دواجار غەزەلێکی حافیزی هێنابوو بە هۆنراوە کردبووی بە کوردیو وەکو خۆی ئەڵێت « بە دەستکاری‌یەکی کەمەوە » ! پێشکەشی خوێندەوارانی خۆشەویستی کردبوو •

ئەوی راستی بێت دەمێکە ئەم چەند سەرنجەم بەرامبەر ئەو نووسینەی دکتور لە خەیاڵی خۆمدا گەڵاڵە کردوەو هەمیشە بۆ دەرفەتێك گەڕاوم کە بیانخەمە بەرچاو ، ئەوەبو لەمدوایی‌یەدا داوام لێکرا شتێك بۆ گۆڤاری « نووسەری کورد » بنووسم ئەمەم هات بەدەستەوە ، بێ‌ئەوەی تێپەڕبوونی نزیکەی پێنج ساڵ بەسەر هەردو نووسینەکەدا ببێتە کۆسپێکی ئەوتۆ کە لەوەکەی خۆم ساردم بکاتەوە ، چونکە ئەمە وەك قەرزێك وایەو قەرزیش کۆن دەبێت بەڵام نافەوتێت •

دکتور ئەڵێت : « حافیز خۆی توانستی بێ‌وێنەی خەیاڵو رەوانی‌و

مەزنی شیعرەکانی دەرك پێ کردوە لە یەکێك لە غەزەلەکانیا ئەڵێ :

**بشعر حافظ شیراز می‌گویندو می‌رقصند (١)**
**سیه‌چشمان کشمیری‌و ترکان سمرقندی (٢)**

دوایی هەر دکتور خۆی لە لێکدانەوەو وەرگیراندنی ئەم شیعرەدا بە پەخشـان ئـەڵێت : « واتە : بـە هۆنراوەکانی حافیـز سـەمائەکەن‌و دەم‌بەدەم ئەی‌ڵێنەوە ، چاورەشەکانی شاری کشمیرو تورکەکانی شاری سەمەرقەند » •

ئەمرۆکە نەك لای ئەوانەی بەخۆیاندا رائەپەرموون شیعری فارمی وەرگێڕن نەخوازەلا شیعری حافیز ، بەڵکو لای خەڵکی ئەدەب‌دۆستیش ئەوە شتێکی بێ‌چەندوچونە کە لە مەیدانی ئەدەبدا مەبەست لە ووشەی « ترك ، تورك » مەعشووقی جوان‌و نازدارە ، واتە « ترك » لە ئەدەبـی فارسیدا « ئیدیۆم = کنایە (٣) »یـە •

ئەمە جگە لەوەی کە ووشەی « تورکەکان » وەکو میللەتێك عەتف ناکرێتە سەر « چاورەشەکان » کە جورە جوانی‌یەکی تەلیسماوی‌یە • کە باسیش هەر باسی جوانی‌یە • ئەگەر هیندی‌یەکانی کشمیری بووتایە ئـەو حەلە رێی‌تێ‌ئەچوو « تورکەکانی سەمەرقەند »مان عەتف بکردایە سەری• ئەگەر بەوجۆرەی دکتور شیعرەکە وەربگێڕین ، نەك هەر ئەژاکێت بەڵکو شاعیرەکەش بە ناشاعیرو بێ‌زەوق‌و بێ‌سەلیقەو درشت‌و گەمژە دێتـە بەرچاو کە ئەمە بۆ شاعیرێـکی وەکو حافـیز هـەزار جـار « حاشا »و « دوور لەو »ی گەرەکە •

لە فولکلوری کوردیشدا « تورك » بە مانای « جوان » هاتووە • بە بیرەوەری من‌و دکتور ـ ئەگەر سەرقاڵی‌ی ژیان بیری نەبردبێتەوە ـو

دوای ئێمەش بە ماوەیەك ئەم چەند شیعرە فولكلۆرەی خوارەوە زۆر باو بوو ، كە دایك كوڕی بەبەرەوەبوو هەڵی ئەپەرانو ئەیووت :

**خوا بدا مرازم**
**حەوت كچی بۆ بخوازم**
**یەكێ بۆ نازو نووزی**
**یەكێ بۆ پاو پووزی**
**یەكێ بۆ تاســو لووســی**
**یەكی بۆ دەستلەملان**
**یەكێ بۆ بوخچەی جلان**
**یەكێ توركی تەماشــا**
**یەكێ دوختەری پاشــا**

شەشەم كچی مرازی دایكی كوڕە خواستنی جوانێكی نازدارە بۆ كوڕەكەی كە وەك حیكایەت خوانی كۆن دەڵێن نە بـكاتو نە بخـوات تەماشای سای گەردنی بكات •

دوای ئەوەی دكتور ئەو تاكە شیعرە بەودەردو مەرەیە دەبات كـە بردی ، ئەڵێت : « لەمە جوانتر ئەم شیعرەیەتی :

**« طی مكانو ببینو زمانو در ساوك شیعر**
**كین طفل یكشبەو یكسالە میرود »**

جارێ دوای ووشەی « مكان » ئەو (و)ەی ناوێت ، هەروەها دوای ووشەی « زمان » ئەو ( و ) ەش پێویست نی‌یە • وشەی فارسیش لەبارەی ڕێنووسەوە هەروەك بە عەرەبی ئەنووسرێ ، لەبـەرئەوە ( شـیعر ) نی‌یە ( شــعر ) ە ، ووشــەی « كــین »یــش نی‌یــە « كـاین »ە ، دوو ووشــەی « یــكشبەو یـكساله » یــش نابێــت « واو »ی عـەتفیــان لەنیواندا بێت ، چونكە ئەگەر وابێت ئەو مانایە دەرناچێت كە دكـتور نووسیوێتی• ئەمە جگە لەوەی ئەو « واو » ە بیێتو نەبێت ئەو « عەجز » ە

بەوشێوەیەی دکتور نووسیویێتی لەنگە ، دکتوریش کە سەردەمێك موحازەرەی لەبارەی عروزەوە لە « کۆلیجی ئاداب » ئەدا ، نەئەبوو ئەوەی وابەئاسانی بەسەردا تێپەڕبێت ، لە ( دیوانی حافیز ) چاپی « ئەمیری کبیر »دا ئەم تاکە وا نووسراوە :

**طی مکان ببین‌و زمان در سلوك شعر**
**کاین طفل یکشبه ره صد ساله میرود (٤)**

لەدوایدا با بێینە سەر ئەو غەزەلەی کە دکتور « بە دەستکاری‌یەکی کەمەوە » ! بە هۆنراوە پێشکەشی کردووە ، سەرەتاکەی ئەمەیە :

**زلف آشفته‌و خوی کرده‌و خندان لب‌و مست**
**پیرهن چاك‌و غزلخوان‌و صراحی در دست » (٥)**

دکتور لە وەرگێڕانیدا بە هۆنراوە ئەڵێت •

**« زولف شیواو خواکردە : دوو لێوی مەست‌و تینو یار**
**سوراحی مەی لە دەستا نیوەشەو دەرکەوت بە لەنجەولار**

دیارە ئێستا دکتور ئەڵێت : من ووتومە « بە دەستکاری‌یەکی کەمەوە » ! بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە بە ئارەزووی خۆی چاوی کامیرەی دیمەن وەرگرتن وەرگێڕێت‌و دیمەنی تازە دروست‌بکات کە لەگەڵ دیمەنی شیعرە وەرگێڕراوەکەدا خواشیان یەك‌نەبێت • دکتور ووشەی « خوی کردە » بە « خواکرد » تێ‌گەیشتووەو کردویتی بە عەتف بۆ سەر « شیواو » و هەردوکیانی ـ واتە شیواوو خواکرد ـ کردوە بە سیفەت بۆ زولف کە بەمە دیمەنی زولفێکی شیواوو سروشتی دێنێتە بەرچاوی خوێنەر • کەچی لەڕاستیدا « خوی کردە » هەر فڕی بەسەر ئەم وەرگێڕان‌و لێکدانەوەیەوە نی‌یە ، « خوی » ( ٦ ) کە بە « خەی » دەخوێنرێتەوە مانای « ئارەقە »یە ، « خوی کردە » ئەوکەسەیە کە ئارەقەی کردۆتەوە • حافیز تەنیا لە « صدر »ی ئەو شیعرەدا واتە لەو نیوە تاکەدا

دیمەنی یەکێك دێنێتە بەرچاو کە « زولفی شیواو »ە هەر ئەوکەسە « ئارەقی کردۆتەوە » (٧)و « بزە لای لێوی گرتووە »و « مەست »ە • من لێرەدا تەنیا هەر لەسەر ئەو « خوی کردە » یە ئەڕۆم و پێ‌دائەگرم و ئەڵێم دکتور بێ‌گومان بە « خواکرد »(٨)ی تێ‌گەیشتووەو « بە دەستکاری‌یەکی کەمەوە » ! فریای هیچ پینەو پەرۆیەکی ناکەوێت • کە بەمە گوڵەباخی ئەو تاکە شیعرە سەرەتایە ئەژاکێت و لقە ناسکەکەی زەرد هەڵئەگەڕێت و وەك کیژۆلەیەکی لە سێدارەدراو بێ‌ناز مل‌ئەنێت بەلاوە •

**پەراوێزەکان :**

(١) لە شوێنێکی‌تردا ئەم شیعرە واهاتووە ،

**بشعر حافظ شیراز میرقصندو می‌نازند**
**سیەچشمان کشمیری‌و ترکان سمرقندی**

« دیوان حافظ ، مؤسسە مطبوعاتی امیر کبیر » ل ٣١١ •

(٢) بۆ ئەو مەبەستەی دکتور ئەو شیعرەی بەنموونە بۆ هێناوەتەوە ئەم تاکەی خوارەوە بەهێزترە •

**حسد چە میبری ای سست نظم بر حافظ**
**قبول خاطرو لطف سخن خدا دادست**

(٣) دکتور معین ئەڵێت : « غوڵام و کەنیزەکانی تورك نەژادان جوان‌بوون ، بەومناسەبەتەوە تورك بەمانای یارو مەعشوقی جوان و نازدار رویشتووەو بەکارهێنراوە » • برهان قاطع ل ٤٨٧ پەراوێزی ژمارە (٧) •

(٤) سەرچاوەی ژمارە ( ) ل ١٦٧ •

(٥) هەمان دیوانی حافیز ل ٣٥ • دکتور لە تێکستە فارسی‌یەکەی لای خۆیدا دوای ووشەی « غزلخوان » ، ( و ) ی عەتفی دانەناوە کە ئەمە شیعرەکە لەنگ ئەکات •

(٦) فەرهەنگی « عمید » ل ٤٥١ •

(٧) ئارەقی دەرداوە ، ئارەق لە هانی‌یەی دەتکێ •

(٨) « خوأکرد » لە فارسیدا هەر « خداکرد »ە •

---

هەتا وەك ئاگری نێو کان لەناو یـــەك
ئەگەر تۆفان بێ لەشکرتان ، بە پووشەك

لە گوێی گا نووستوون بۆیە کە ڕێوی
لەسەر ئێوە وەها شـێرە وەکوو سـەگ

**حاجی قادری کۆیی**

---

ناظم حیکمەت

# بۆ نووسیارانی ئاسیا ـ ئافریقا

شوکر مستەفا

لە تورکی‌یەوە وەری گێڕاوە

براکانـــم ،
مەڕوانە ئەوەی قژم زەردە ،
من ئاسیاییم .
مەڕوانە ئەوەی چاوم شینە ،
من ئافریقاییم .
دارو درەختەکانی ئەوێی من سێبەریان بۆ ژێر خۆیان نیە کوت‌ومت وەك ئەوانی ئەوێی ئێوە .

لەوراکەی من نان لە دەمی شێردایە
سەرچاوە حەزیای لەسەر دەنوێ
پانپانکی لەسەرە .
پێ لە پەنجا نانرێ دەمرێندرێ لەوێ
کوت‌ومت وەك ئەوانی ئەوێی ئێوە .

مەڕوانە ئەوەی قژم زەردە ،
من ئاسیاییم ،
مەڕوانە ئەوەی چاوم شینە ،
من ئافریقاییم .
لە سەتا هەشتای ئەوانی من نە خوێندنەوە دەزانن ،
نە نووســین .

شیعر دەماودەم دەگێردرێ ، بە گۆرانی دەگوترێ
شیعر دەتوانێ لەوێی من ئالآپیرۆزە بکا
کوتومت وەك ئەوانی ئەوێی ئێوە •

براکانم !
دەبێ شیعرەکانمان بەگەڵ گاڕیوەڵە کەون
جووتیان پێ بکرێ
دەبێ بتوانن بچنە نێو زۆنگی مەرەزەوە
تا چۆکان •
دەبێ بتوانن هەموو پرسیارێ بکەن
دەبێ هەموو مەشخەڵێ بتوانن خڕکەنەوە
دەبێ بتوانن لە سەرەڕێیان بوەستن
دەبێ شیعرەکانمان وەك کێلەڕێی کیلۆمەتر خوێنەوەکان بن
کە دژمن نزیك کەوتنەوە بتوانن
بەر لە هەرچی بەدییان کەن
دەبێ بتوانن لەناو جەنگەڵستاندا لە تەمتەمان بدەن ،
ئەوەی لەم سەرزەوی‌یە دیلە ،
تەنیا ولآتە ،
تەنیا مرۆ •
تا گەواڵە هەورێکی بەئاتۆم بەئاسمانەوە بمێنێ
دەبێ شیعرەکانمان سەروەتو سامانیان ،
ئاوەزو بیریان ، ڕۆحو گیانیان ، هەرچی‌یان هەیەو نیە ،
بە ئازادیی گەورەی بدەن

١٩٦٢

# رێبازگەی مەولەوی

## سەرهەڵدانی هـۆزانڤانی جیهانـی
## سـەرەتای وێژەی نـوێی تـورکی

« کەریم زەند »

لە نووسراوی « ئایین‌و باوەر لە کوردستان‌دا » لە بڕگەی پێنجەم لە بەشی دووەم لـەو زنجیرە پەی‌دەرپەیـەی پارسـایی‌و باوەڕیاری‌و سۆفیزمی ، لە سەرەتای پەیدابوونیەوە بەپێشەوایی ئەلی ئەحمەد یوسف هەکاری لە دێرەش لە ئامیدی‌یەوە بەرەو میرستەك ـ سپیندار ـ ئارامگەی شیخی ئیسلام ، لە دێرەش ، لەناو دارستان‌دا بە شانێکەوە بە بیست خولکە لە گوندی رەژۆکەوە لەبن کەڤرۆز ، زنجیرەی رانگەڵە لـە چیای گارە ، ئەم بەرێزە لە ٤٠٩ ی کۆچی هاتۆتە جیهانەوەو گۆشەنشینی دێرەش بووە ، لە چەرخ‌و سەردەمی شێخ ئەلی‌یەوە ، مێژووی سۆفی گەری سەرهەڵ ئەدات لە کوردستان‌دا ، ئامۆژگارو فێرکاری شێخ عەبدولقادری گەیلانی بووە کە دامـەزرینەری رێبازگـەی قادری‌یـە ، رێبـازگەی مەولەویش لکی ئەم رێبازگەیەیە ، یە پێشەوایی مەولانا جەلالەدینی رۆمی کە زوربەی خاوەرناسان لەوباوەڕەدان کە هۆزانڤانی جیهانی‌یە وەکوو لە نووسـینەکەی مامۆستا زامـدار مەحمـوودا دەرکەوتـووە ڕۆژنامـەی پاشکۆی عیراق ژمارە ٤ ی سـاڵی ١٩٨١ بە ناونیشـانی لالانەوەیەك لـە جیهانی مەولانادا ئەڵی :ـ

ئەم مرۆڤە سەوداسەرە لە ساڵی ۱۲۰۷ ی ز لە شاری بەڵخ چاوی بە جیهان هەڵهێناوەو لای سۆفی مەزن فەریدەدینی عەتارو لای باوکی خوێندوویەتی ، هەروەها لای شاگردی باوکیشی بورهانەدینی تورمزی ، دوای ماوەیەك وازی لە زانست هێناو سۆفی گەریتی کرد بە پیشە • لە چاخو سەردەمی داگیر کردنی بەڵخدا لە لایەن جەنگیز خانەوە ، لەتەك خانەوادەکەی‌دا بەرەو شاری کۆنیە چوون‌و لێی ماونەتەوە ، لە بورسەی تورکیا ئەو ڕێبازگەیەی گرتووە ، لەوماوەیەش‌دا دۆستایەتی لەتەك شەمسی تەورێزی پەیدا کردووە ، بەگوێرەی نووسراوەکەم ، شاگردی بووە ، بە شێوەیەکی وا پابەندی بووە ، دیوانەکەی خۆی بە ناوی ئەوەوە ناوناوە ، کۆچو کوشتنی شەمسی تەورێزی ( ۱۲۷۲ ) کارەساتێکی مەزن‌و دەردی‌سەری بۆ مەولانای ڕۆمی پەیدا کردووە ، لە ئەڤینی ئەو ڕێبازگەی مەولەوی دامەزراندووە ، ئەو کڵاوە تایبەتی‌یەی کە شەمس کردوویەتی‌یە سەری بووە بە دروشمی خۆی‌و دەرویشەکانی کە بە ئەنجومەنی گوێگران ناسراون ، هەفتەی جاری کۆڕو ئاهەنگی بەجۆش ئەبەسترا بە سەماو ژەنینی موسیقاو شمشاڵ‌و زیك‌و لاڵانەوەی دەروونی‌و گۆرانی‌یەوە ، تەنانەت خاوەرناسان پێیان‌وتوون سەماکەران ، کەچی خاوەرناسی ئینگلیزی ـ رید هاوس ، هەموویان بە سەماکەر دانانێت ، بەڵکو هەندێکیان بە مۆسیقاژەن‌و هەندێکیان بە گۆرانی‌بێژو جارجاریش بە تێکرایی هەموو بە سەماکەریان دادەنێت •

« ئەم ڕێبازگەیە لەتەك ڕێبازگەکانی‌تر لەلایەن میریی کەمالی‌یەوە قەدەغە کراوە ، نووسەرێکی گۆڤاری « ئەلموقتەتەف » لەمیسر وتوویەتی ئەم ڕێبازگەیە لە سەرهەڵدانی شۆرشی شێخ سەعیدی پیرانەوە بووەو لە ۱۹۲۵ دا قەدەغەکراوە » بەڵام کۆماری تورکیای ئیستە ڕێگەی داوە بە دەرویشەکانی لە شاری کۆنیە ، شاری مێژوویی دوور ، لە سەربەستی

ئافرەتو مەیو مەیخانەو رابواردنو خۆشی ، پارێزراو ، ئاخاوتن تێدا قەدەغەکراو ، شاری هەڵپەڕکێو سەمای کاریگەری دەرویشی چاوپۆشو کڵاوی کاسکی درێژی گومەزی هەڵچوو ، لەم شارە بۆ ماوەی ٤٨ سەعات هەموو ساڵێ یادی کۆچی مەولانای رۆمی بکەنەوە بەتایبەتی لەبەر گەشتیاران بەئاوازی تەپڵو شمشماڵو کەمانو قانوونو ئامیریتری موسیقاوە زۆر بەرێکی لەبەر ریزی مەزنەکەیان دەچەمێنەوەو کرنووش ئەبەن لە بەرانبەریاز ، هاواری یەزدان دەکەن بە زمانی دەروونیو لالانەوە ، خولدەخۆن بە بزووتنەوەیەکی رێکو هاواری گشتیو رێنەدان بە هیچ شتی جگە لە بێدەنگیو کشو ماتیو خامۆشی ، بۆچرووکی هەناسەو بۆکرووزی پۆنگی خواردۆتەوە لە گەرووەوە بۆ ناو دەمو دەرەوە ؛ هەڵاوو هەڵمی پەستیوراوی وەك ستوونی دووکەڵ بەرزئەبێتەوە بەرەو ئاسمان ، تارماییەیان وەك تەشی خولدەخواتو کارگیرانیان ماوەی کەس نادەن بدوێ ، بە هەڵبەستی بوێژی پارسا مەولانای رۆمی دەست پێئەکات بە زمانی عەربیو تورکی بەدوای مۆسیقای کلاسیکیدا کە حەوتسەد ساڵ پترە هیچ گورانێکی بەسەردا نەهاتووە ، ئاوازی بەسۆز وەك ریزی نوێژ دەرویشەکان جێی خۆیان دەگرت وەکوو لە جیهانێکیتردا بن ، چاوی کڵاپۆش باڵا بەرزەکانیانی داپۆشیوە ، ریش وەك پەیکەری تاشراوو هەڵکەنراو ، سەریان کاسكو کڵاوی قوتو درێژو هەڵچووی گوومەزی بزووتنەوەی گشتیو رێك ، هاواری یەزدان بەتێکرایی ، بەتەزبیحەوە ، خامۆشیو کپیو نەدوویيو نە بێزاری پیشاندانو نە چەپلە ، تا ماندوودەبن ، هەناسەی قوول هەڵدەکێشن ، دەست بەرزئەکەنەوە بۆ ئاسمان بۆ وەرگرتنی فەرو پیتی خوداوەندی مەزن ، بۆئەوەی بە دیاری پێشکەشی جیهانی بکەنەوە ، دووبارە جوێ دەبنەوە بۆ گرتنی کۆریکیتر وەکوو مێژوو لە

بەرچاویاندا سوورو خول بخواتو بزوێت ، بەجۆشەوە ئەدوێنو ڕاڤەی ڕێبازی خۆیان دەکەن وەك کانی‌یەکی مەنگی بێ‌بن ، بریسکەی فوسفۆڕ لە چاویاندا گەش‌و پرشنگ‌دارەو لە بێ‌دەنگی‌دا ئاگاهی وتەی رابوردوو ئەگەیەنن‌و بەسەرهاتو سەرگوزشتەی مێژوو دەگێرنەوە لە بەرهەمەکانی مەولەوی‌دا لە دیوانی شەمسی تەورێزی‌و مەسنەوی‌دا بە شەش بڕگەو کێشی ڕەمڵ ، ئەگەرچی مەسنەوی کێشی دوودووە ، نووسراوێکی ئاینی پیرۆزە ، هەلبەستەکانی فارسی‌یە ، پەی‌پێ‌بردنی رازەکانی ، گەیشتن بە یەزدانی پاكو جاویدە ، گەیشتن بەراستی‌یە •

( بەشێکی زۆری ژیاننامەی‌و لەتەك هەلبەستەکانی‌دا ، وەرگێرراوە بۆ سەر زمانی جەرمەنی‌و ئینگلیزی‌و فەرەنسی‌و عەرەبی‌و کوردی کە بە لاتینی کراوە ـ زامدار ـ هەمان سەرچاوە ) •

لە گۆڤاری بەیان ژمارە ٧٩ ساڵی ١٩٨٢ لاپەرە ٥٥ی بە ناونیشانی « بەشێك لە وێژەی هاوچەرخو نوێی تورکی لە وەرگێرانو ئامادەکردنی مامۆستا سەلام ئەحمەد ـ ئەڵی ـ بە هاتنی هوزانڤانی فارسی جەلالەدین ڕۆمی لە ئێرانەوە بۆ تورکیا لە دەوروبەری سەدەی حەوتەمی کۆچی‌و نیشتەجێ بوونی لە شاری کۆنیە لە ئەنەدۆڵ ، هەڵبەستی تورکی چووزەرە دەکاتو سەر هەڵئەدات • ئەوسا باوی زمانی فارسی بووە لەبەر ڕەشە خەڵکەکە کە لەتورکی بەولاوە زمانی‌تریان نەزانیوە، بەناچاری جەلالەدینی ڕۆمی بە زمانی تورکی هەڵبەستی داناوە کە بە سەرەتای هەڵبەستی تورکی دادەنرێت بە بابەتی سوفیزمی‌و تێکەڵ بە ڕۆشنبیری فارسی وەك ئەم نموونەیە :

ئەگەر وەك برایەکی میهرەبان بوایە بۆت
یا نەخۆ مامۆستایەکی دڵ‌ڕەق بوایە بۆت

هەر ئەو ڕێنومایی دووری ئەکردی
مشتت بۆ شوانەکە توند بگرەوە
گورگەکان وا بەرامبەرت وەستاون
گویم لێ بگرە ، گویم لێ بگرە ئەی بەرخۆلە ڕەشتاڵەکەم

دوای کۆچی جەلالەدینی ڕۆمی ، سوڵتان وەلەدی کوری ئەبێت بە جێنشینی ئەویش ڕازەگوزاری پێشخستنی هەڵبەستی تورکی کردووە بەو نیازە کە دەرویش لە خۆی گردبکاتەوەو عاشق پاشاش بەم ڕێو شوێنەدا ئەڕوات وەکوو گوڵشەهری لە دەوروبەری ساڵانی ۱۳۱۷ چەند نووسراوێك لەسەر سۆفی گەری لە فارسی یەوە وەردەگێڕێت بۆ سەر زمانی تورکی لەوانە ژیربێژی باڵندەی فەریدەدینی عەتار هەڵبەستەکانی ئەحمەدی ، خاوەنی ئەسکەندەرنامەو سلیمان چەلەبی ، خاوەنی مەولودنامەی پێغەمبەر ( د ) ، بەری بۆ فراوان دەبێت لە پەلهاویشتنی میری دا •

**چاوگ**


١ ـ نووسراوی ئایین‌وباوەر ـ زەند ، کەریم •

٢ ـ ڕۆژنامەی پاشکۆی عیراق ژمارە ٤١ ساڵی ١٩٨١ •

٣ ـ گۆڤاری بەیان ژمارە ٧٩ ساڵی ١٩٨٢ ل ٥٥ •

# قـەلەڕەش

**شیعری : ئێدگار ئالان پۆ**
**وەرگێرانی لە ئینگلیزییەوە :**
**شێرزاد حەسەن**

نیوەشەوێکیان ••
نیوەشەوێکی زۆر ماتەمین ••
شل‌و شەکەت‌و بێزار ڕادەمام
خەیاڵێ دەیهێنام‌و •• خەیاڵێ دەیبردمەوە
هەر بەدەم ئـەو خەیاڵەوە ••
لە حیکمەتی دێرین‌و لەیادچووی کتێبێك ••
وردده‌بوومەوە
بەدەم خەوەوەش وەنەوزم‌دەدا •• بەم‌لاو بەولادا دەکەوتم
دەنگێکی نزم ••
کوت‌وپڕ هاتە بەرگوێم‌و بێداربوومەوە
وەك کەسێ هێواش لە دەرگا بدا
بەئاستەم لە دەرگای ژوورەکەم بدا
چرپاندم •• وتـم :
« میوانەو لە دەرگای ژوورەکەم دەدا ••
ئەوەو هیچی‌تر نەهات بەدوایدا • »

★ ★ ★

ئاه •• جوان دێتەوە یادم ••• وەك ئێستا
له مانگی ( بەفرانبار )ی (١) ساردو تەزیوی پڕ ڕەشەبا
هەر پشکۆیەکی تەنیاو مردوو
سێبەری مەرگی •• لەسەر زەوی جێ‌هێشتبوو
پڕبەدڵیش خۆزگەم دەخواست ••
چاوەڕوانی بەیانی بووم

بێ‌هوودە بـوو
بۆ کۆتایی خەمو مەینەتیم لەنێو کتێبەکانا ونده‌بووم
خەمو مەینەتی بۆ ( لینۆر )ی لەدەستچووم
بۆ ئەو شۆخە بێ‌هاوتایەو ••
ورشەبارەی ••
فریشتەکان بە ناوی ـ لینۆر •• لینۆر ـ بانگیان‌دەکرد
کەچی ئیتر بۆ هەتاهەتایـــــه
تا لێرەدا نـاوی نایـــــه ••!

★ ★ ★

ورشەی پەردەی ئاوریشمینی ڕەنگ ئەرخەوان
دەڕژێ لەگەڵیا چپەی خەمو دەردو گومان
موچڕکە ئەخاتە سەراپای گیان
ترسێکی ئەفسووناوی سەیر دامدەگرێ
ترسێك •• لەمەوبەر قەت نەمدیبێ
هەر لەتاو تینی ئەو ترسە ••
هەڵدەستمەوە سەرپێ
بە خۆم دەڵێم •• دەیڵێمەوە

---

(١) بەفرانبار : کانوونی یەکەم •

تا کوتەکوتی دڵم بوەستێو •• ئارام‌بێتەوە :

« میوانێکەو دەرگای ژوورەکەی لێ گرتووم ••

دەپاڕێتــەوە ••

میوانێکی درەنگ‌وەختەو لە بەرقاپیی ژوورەکەما •••

وا بەدڵ دەکڕووزێتەوە

هەر ئەوەیەو •••••• دەبڕێتەوە • »

★ ★ ★

دەرحاڵ ڕۆحم گەشەی کردو •• پرزەو هێزم هاتەوە بەر

نەوەستام‌و بێدوودڵی •• دەنگم هەڵبڕی ••

پێم‌وت : « بەگم •• یان •• هۆ خانمەکەم ••

لە دڵمەوە داوای لێبوردن دەکەم

من تازە چاوم دەچووە خەو ••

کە تۆ لە دەرگات دەدا ••

بەئاســتەم

هێواش هێواش لە دەرگات دەدا ••

دەرگای ژوورەکەم

بێ‌ئەوەی پڕبەگوێ هەستی پێبکەم ••

دەرگام بۆ خستیتە سەرپشت

کە ڕوانــیم جــگە لە تاریــکی ••

هیچ شتێکی دیکەم نەدی ••!

★ ★ ★

زۆر لەوێ وەستام •• بە هەردوو چاو لە قووڵایی تاریکی ڕادەمام

سڕو سەرسام •• دەلەرزیم‌و دەترسام

بەدگومان‌و شڵەژاو ••

ئەو خەونانەم دەهاتنەوە بەرچاو

بەر لە من •• ڕوحلەبەرێ نەیدیبن

بەڵام شتێ بێدەنگی ئەو ناوەی نەدەشکاند

چرپەك خامۆشی نەدەزڕاند

تەنها وشەیەك بە دەنگی چپەدوو ••

چرپەی ناوی ـ لینۆر ـ بوو

« لینـۆر ؟ »

منیش چرپاندم •• چپەی ناوی هاتەوە بەرگوێم

« لینـۆر ! »

هەر تەنها ئەوەو هیچیتر !

★ ★ ★

گیانم دەسووتا •• گڕ لە دەروونم هەڵدەستا

بۆ نێو پێخەف گەڕامەوە ••

دیسانەوە •• توندتر لە دەرگای دایەوە

وتم : « بێشك •• شتێ هاتووەتە سەر پەنجەرەکەم

کەواتە با بزانم •• ئەم نهێنییە بدرکێنم

تا دڵم بسرەوێ ••• با ئەم تەلیسمە بشکێنم ــ

بەڵام جگە لە ڕەشەبا ••

من هیچیدیکە نابینم ! »

★ ★ ★

توند پەنجەرەکەم کردەوە ••

قەلەڕەشێك •• تیژ باڵی لێکداو بە فڕەفڕ هاتە ژوورەوە

قەلەڕەشێکی بەهەواو فیزو مەزن ••

شیاوی ڕۆژانێکی دێرینو پیرۆزی جەژن

بێ ڕازو سلاو •• بێ نووشتانەوە ••
بێ وەستانو لێکدانەوە ••
بە هەواو فیزی لۆرتێکەوە •• بە نازو نووزی خاتوونێکەوە
هاتو لەسەرووی دەرگا ••
هەڵنیشتو باڵی لێك نا
لەبان پەیکەری « پالاس »(١)ی سەر تاقی دەرگا
لەوێ قوتومت هەڵتووتا
هەر ئەوەو هیچی تر •• نەمدی پتر •• !

★ ★ ★

ئەوسا باڵندەی ڕەنگ ئەبەنووسی •• دڵی دامەوە
خەونو خەیاڵی پڕ لە خەمی •••••• ڕەواندمەوە
لەسەر لێوانما زەردەخەنەی چاند ••
گەرچی لەناو ڕەنگی ڕەشو ناشیرینی پرسەداران ••
خۆی دەنواند
پێموت : « ئەگەرچی تۆ بێ پۆپنەش بیت ••
بەلام خۆ هەرگیز ترسنۆك نیت
ئەی قەلەڕەشی ئەرژەنگو پیرو دڕو خێوئاسا ••
ئەی پەراگەندەو تەریوی کەنارانی تاریکی دەریا
پێم بڵێ : بە چ ناوێکی لۆردانەو مەزن
لەوێ •• لە تاریکی شەوی دۆزەخییا ناوت دەهێنن ؟ »
دەرحاڵ قەلەڕەشی بۆر ••
وەلامی دامەوە : « نێڤەرمۆر ! »

★ ★ ★

(١) پالاس : لای یۆنانیەکان خوای ( ژیری ـ حیکمەت ) بووە•

سەرمسوڕما •• چۆن وا شیرین مەلێکی ئاوا ناشیرین گوێم‌لێ‌دەگرێ
گەرچی وەڵامەکەیشی دوورەماناو •• کەم پێوەندی بێ
بەر لە من •• هیچ ڕوح‌لەبەرێ نەیدیبێ
پەلەوەرێ بەهاتنی پیرۆزی کاو ••
لەسەر تاقی دەرگاکەیا هەڵبتووتێ
باڵندە •• یان گیان‌لەبەرێکی نەگریس بێ ••
بێو•• لەسەر پەیکەری دەرگا هەڵبنیشێ
ناوی چی بێ ••• « نێڤەرمۆر » بێ !

★ ★ ★

بەڵام قەلەڕەشی تەنیا •• لەسەر پەیکەری بێ‌دەنگی کە هەڵنیشت ••
هەر تەنها ئەم وشەیەم لێ بیست ••
هەر وەك بڵێی ئەم وشەیە هەموو ڕۆحی هەڵمژیێت
بۆ تەنها جارێکی‌تر نەیقیژاند •• تەنها پەڕێکی نەبزواند
تا من بە چرپە وتم : « بەر لەو زۆر هاوڕێی ترم هاتن‌و ڕابوردن ••
بەیانی ئەویش جێم دێڵێ
وەك هەموو هیواکانم •• دوور فڕین‌و تێکڕا مردن
دەرحاڵ قەلەڕەش وەڵامی دایەوە :
« هەرچی چوو ••• نەگەڕایەوە ! »
لەو خامۆشی‌یە دەترسام •••
کە زەنگی وەڵامێکی ئاوا بەجێ بیزڕێنێ
بە خۆم وت :
« لەوە بێ‌شکم •• ئەوەی قەلەڕەش کردی‌و •• وتی •••
تاکە سەرمایەو دوا گەنجینەی بیری خۆیەتی
کە دەشێ ••• پیاوێکی سیاچارەو نیگەران فێری‌کردبێ

پیاوێ •• چارەنووسی ڕەشی خۆی •• لێرەو لەوێ •••
بێبەزەییانە •• خێراو •• خێراتر ڕەدووی کەوتبێ
تا وای‌لێ‌کردبێ •• گۆرانیەکانی بە ئیقاعو نەزمو پێ ••
لەسەر یەك ئاوازی خەم بڕژێنە بەرگوێ
بالۆرەی شینو ماتەمینی هیواکانیشی ••
هەر هەمان نەغمەی خەمو ژانیان هەڵگرتبێ ••
ئەو تەنها نەغمە بۆن گرتووەی گۆڕ
نەغمەی غەمگینی « نێقە •• نێقەرمۆر ! »

★ ★ ★

قەلەڕەش دیسانەوە •••
خەیاڵی پڕپەژارەی لێ سەندمەوە •• بزەو خەندەی دەدامەوە
دەرحاڵ کورسی‌یەکم هێنا •• بەرامبەری قەلەڕەش •• پەیکەرو دەرگا••
بێدەنگ قاچم لێ ڕاکێشا ••
پاشان •• لەسەر مەخمەری کورسی نەرمو نیان ••
خەیاڵم بەدەم خەیاڵێکەوە گرێ‌دەدان
ئاخۆ مەلی پیرو بەدفەساڵو خەمهێنی شووم
مەلی وا ناشیرینو پەڕپووتو خێوئاسای بەدیووم
ئاخۆ مەبەستی چی بوو قەلەبۆر ••
کە بۆی قڕانم : « نێقەرمۆر

★ ★ ★

متقم نەکردو لێی دانیشتم ••
کەوتمە مەزەندەو تەخمینو خەیاڵ ••
چی گەرەکە با بزانم
گڕو بڵێسەی چاوەکانی ناخو ڕۆحی دەسووتاندم

وردبوومەوە تا تێی بگەم •• پێشبینی نەگبەتێ بکەم
سەرمخستبووە سەر بالیفی بەرگ نەرمی مەخمەری
کە بارانی پرشنگی چرا جوان بەسەریا دەباری ••
وەلێ مەخمەری وەنەوشەیی ژێر شەوقی چرا ••
ئاخو سەد داخ چیی لێ ناکا •• !

★ ★ ★

دوایی لای خۆم وام هەست دەکرد ••
بخوری نێو بخوردانێکی بزر •• بۆنی هەوای خۆشتر دەکرد
فریشتەیەکی نزیکی خواوەندیش •• بخوردانەکە دەباو دەهێنێ ••
فریشتەیەك بنی هەردوو پێیەکانی لە سنگی زەوی •• بخشینێ
دەیسوورێنێ !
هاوارمکرد :
« تۆ ئەی بەدبەختو چارەڕەش ••
سەیرکە خوا چیی بۆ کردی •• بە فریشتەکانیا چیی بۆ ناردی :
حەوانەوەو سێبووریی دەردی تەنیایی ••
شەرابی خەمڕەوێنو دڵنەوایی ••
بادەی ئازاربەری یادی لینۆرو جودایی
هەڵیدەو •••
بە یەكبین ئەم شەرابە نۆشکە
خەمی کۆچی لینۆری جوان فەرامۆشکە
دەرحاڵ قەلەڕەش وەڵامی دایەوە :
« هەرچی ڕۆیشت •• نایەتەوە ! »

★ ★ ★

پێموت : « ئەی پێغەمبەر •• هۆ ڕۆحی شەڕ ••
تۆ کامیانیت ؟
گەرچی تۆ پێغەمبەریش بیت •• یان شەیتانو •• یا پەلەوەر بیت
گەر ڕەشەبایەك بۆ ئێرەی ناردی ••
یا ئەهریمەنێ دەری کردی
کە لێرە وا تەنیاو پەستی •• گەرچی ئازاو سەرسەختی
لێرە لەم بیابانە •• کە پڕ سیحرەو پڕ ئەفسانە
لێرە •• لە ماڵی وا پڕ سامو ترسم •• تکادەکەم ••
لێتدەپرسم :
ئاخۆ لای ( یەهوزا ) ش هیچ مەرهەمێ چنگدەکەوێ
ژانو ئازارم لابەرێ ؟
قەلەڕەشی بەهەواو فیز
دەرحاڵ وتی : « هەرگیزاو هەرگیز »

★ ★ ★

پێموتەوە : هۆ پێغەمبەر •• یان ڕۆحی شەڕ ••
تۆ کامیانیت ؟
گەر تۆی پێغەمبەر •• یان شەیتانیت •• یا پەلەوەر
سوێندتدەدەم •• تو ئەو ئاسمانەی ژوور سەرمان
تو ئەو خوایەی کە سەرووەرە بۆ هەردوومان
بەم ڕۆحە خەمبارەم بڵێ •• کە لەژێر باری خەمو ژاندا دەنرکێنێ
ئاخۆ لەگەڵ ئەو شۆخە چاکە •• ئەو کچە پیرۆزو پاکە
دەگەینەوە دەستلەملانێ ؟
دەپێم بڵێ : ئاخۆ لەوێ •• لە بەهەشتی دووری ( عەدن ) ••
کە پەرییەکان ئەو جوانەم بە ناوی ـ لینۆر ـ بانگدەکەن

ئاخۆ تێر دەیگرمە باوەش •• ئەو شۆخی وا درەخشانو گەش ؟
کەچی قەلەڕەشی بەهەواو فیز
بۆی قڕانم « هەرگیزاو هەرگیز »

★ ★ ★

کە کوتوپڕ زریکاندم « گەر پەلەوەریت یان ئەهریمەن ••
با ئەوەیان دوا وشەی جودایی بێ •• دوا دەنگی ماڵئاوایی بێ •
بگەڕێوە نێو زریانو باوو بۆران •• نێو شەوی دوزەخیو ••
تاریکی کەناران
هیچ پەڕی ڕەشی تۆم ناوێ •• بە جێی‌بێڵی
وەك یادێکی ئەو درۆیەی کە لێرە ڕۆحت درکاندی
بەجێم‌بێڵەو •• بێ‌دەنگیم لێ مەشڵەقینە ••
دەی دەنووکت لەو گۆشتەی دڵم دەربێنە ••
بەسە •• ئەم بەردەرگایەم لێ مەگرە ••
ئەم پەیکەرە بەجێ‌بێڵەو بۆ خۆت بفڕە
قەلەڕەشی بەهەواو فیز
دەرحاڵ وتی : « هەرگیزاو هەرگیز »

★ ★ ★

هەر لەوساوە قەلەڕەش ••
لەبان پەیکەری ( پاڵاس )ی زەردباوی سەر دەرگاکەم ••
هەڵنیشتووە
هەر لەوێیە ••
قەت نابزێو متو بێ‌دەنگ دانیشتووە
خۆ چاویشی لە چاوی شەیتانێك دەچێ ••

شەیتانێ خەون بینێ !

کە قەلەڕەش ••
تیشکی چرای بەر دەکەوێ ••
سێبەرەکەی بەو ناوەدا دەڕژێو دەکشێ
ڕۆحی منیش قەت لە بازنەی ئەم سێبەرە نابێتەوە ••
هەرگیزاو هەرگیز هەڵنافڕێو بۆم بێتەوە !

**ســەرنج :**

( نێفەرمۆر ـ Nevermore ) وشەیەکە لە کۆتایی زۆربەی کۆپلەکاندا دووبارە دەبێتــەوە •• بە کوردیش واتــاکەی ( هەرگیزاو هەرگیز ) دەگەیەنێ یاخود بــە واتایەکــی دیــکە ( ئــەوەی چوو ••• ناگەڕێتەوە ) •• بــەڵام خــۆی وەك ماناو دەنگ ( ئێدگار ) بایــەخێکی تەواوی بەم وشەیە داوە •• بۆیە زۆر لە وەرگێڕە عەرەبو بێــگانەکان لەو باوەڕەدان وشەکە وەك خۆی بە ئینگلیزی بنووسرێتەوە •• هەندێکی تریش ڕایان وایە کە وەك واتای خۆی وەربگێڕدرێتە سەر زمانەکــەی دیکە •• بەڵام من ـ بەگشتی ـ لە وەرگێڕانی ئەم شیعرەدا تا سنوورو خواستی شیعر سەربەستیم بە خۆم داوە • ئەوەشمان لەبیرنەچێ ( پۆ ) پێی دەوترێ شاعیری قەلەڕەش !

چیرۆك :

# « ڕەش‌پۆشێکی جیهانی چوارەم ! »

مســتەفا ساڵح کەریم

خۆرەتاو سەرزەمینەکەی داخ‌کردبوو ، گەرماو • چاوەڕوانی‌و پاڵەپەستۆ ، بێزاری‌یان لە ناوچەوان‌و ڕووی خەڵکێکی زۆری ناو گەراجە گەورەکەدا نەخشاندبوو ، تۆش ئەوکاتەدا خۆت بەناو خەڵکەکەدا کرد، جانتاکەت لەلایەکەوە داناو بەدیاریەوە وەستای ، ئەوەی باش‌بوو لەکۆڵ پاڵ‌پێوەنانی بلیت کەوتبووی ، چونکە لەوەپێش وەرت‌گرتبوو ، وەك بۆ ناسیاوێك بگەڕێی چاوەکانت بــەناو عەشاماتەکــەدا ئەگــێڕا ، لەم‌لاتەوە کۆمەڵە کچێك بە بلیتەکانی دەستیانەوە لە شوێنەکەی تۆ نزیك‌ئەبوونەوە ، بەدەم قسەکردنەوە ئەتریقانەوە •

ئوتوموبیلێك خۆی بە گۆڕەپانی گەراجە گەورەکەدا کردو لـــە شەقامە باریکەکەی بەردەمتا خێزانێکی هەڵرشت • ئەوناوە هەموو لـــە بزوتنەوەو بەیەکاهاتن‌و ژاوەژاوا بوون ، بەڵام تــۆ گێژو وڕ بــووی ! هەستت بە سڕبوونی ئەندامەکانی لەشت ئەکــرد ، باڵا وردیلــەکەت ، کراسە ڕەشەکەت کە ناوقەدتی هێنابوەوەیەك ، قژەڕەش‌و خاوەکەت کە هەمــوو لامــل‌و ناوشانــتی داپۆشیــوو ، چاوە گەشــە خەمبارەکانت ، لێوە هەڵبزرکاوەکانت ، ئەمانە هەموویان سەرنج ڕاکێش بوون ، بەڵام تۆ لە جیهانێکی‌وادا ئەژیــای ئاگاداری‌ئــەوە نەبــووی کە ئاخــۆ کەس سەیرت‌ئەکا یان نا ؟

« جاران ناسك پێی ئەوتم ئەڵێی ئەم خەڵکە لەئاستی منا کوێرایی‌یان داهاتوە ، هەموو هەر چاو ئەبڕنە تۆ »

ئەو خێزانەی تاوێ لەوەوپێش گەیشتن منالێکیان پێ‌بوو ، دایك‌و باوکی زۆر بەدەوروپشتیا ئەهاتن ، باوکە ساردی بۆ ئەهێناو دایکەش خێرا خێرا دەستی بەسەرو قژیا ئەهێنا « کە لە تەمەنی ئەو منالەدا بووم دایکم گەلێ‌جار بەر چەپۆکی ئەدام‌و ئەیوت : سەرت شین کەی دوور لە سەری تاقە کوڕەکەم ، تۆ سەرەخۆرەی ، چلەت نەچوبوو کە تەرمی باوکە جوانەمەرگەکەتیان بە کوژراوی هێنایە بەردەستمان » •

ئەم ووشانەی دایکت بەدرێژایی ژیانت لەگوێتا ئەزرنگایەوە ، لەناختا هێلانەیان کردبوو ، جارەها بەتەنیا ئەتدایە پڕمەی گریان‌و بەزەیت بەخۆتا ئەهاتەوە ، لە دڵی خۆشتا ئەتوت « بۆ ئەبێ ئەو کارەساتە گەورەیە دەستی منی تێدا بووبێ ؟ منێك کە بە دەسرازەیەك لەناو لانکەدا شەتەك درابم چ دەستەڵاتێکم بوە تا سەرەخۆرە بم ! »

جارجارەش لای خۆتەوە پاکانەت بۆ دایکت ئەکردو ئەتوت « ناحەقی نی‌یە ، ئەرکی ژیان زۆر گرانە ، بێوەژن‌کۆشیش کارێکی ستەمە ، ناچارە داخی دڵی خۆی بە ئێمە بڕێژی ••• بەتایبەتی منی پاشەبەرە » •

ئەم راستی‌یە کە لەناختا لەگەڵ چەپۆك‌و ووشەکانی دایکتا لەکێشەدا بوون کارێکی گەورەی کردبوە سەر دڵ‌و دەروونت بەتایبەتی لە قۆناغی خوێندنتا کە بۆت دەرکەوت بێ‌باوکی چەند رووداوێکی تاڵە ، بۆیە زۆر جار ئاواتت ئەخواست کە تۆش وەك ئەو خەڵکە لەپاڵ دوو خوشکەکەت‌و تاقە براکەتا لەژێر سێبەری باوکتا گەورە ببووناییە « چی‌ئەبوو ئەگەر دایکم ئاوا لە تافی جوانییا بێوەژن نەکەوتایە » •

تیشکی خـۆر لـە چاوەکانـتی دا ، لـە جانتـا بچکۆلەکەتـا چاویلکەکەت دەرهێناو کردتە چاوت ، سەیرت‌کرد خەڵکەکە بەرەبەرە ڕوەو ناو پاسەکە تەکان‌ئەدەن ، تۆش سەرکەوتی ، پاس بەڕێ‌کەوت ، لەگەڵ خولانەوەی پێچکەکانیا بیرەوەری‌یەکانی تۆش وەك شارە میروولە وروژابوون ، بۆ ساتێ پەردەی پەنجەرەکەت لاداو سەیری ئەم‌لاو لای شەقامی شارە جەنجاڵەکەت ئـەکرد « ٢٥ سـاڵم لەم شـارەدا بەسەربرد ، بە هەموو ناخۆشی‌و خۆشی‌یەکیەوە ، بە تاڵی‌و شیرینی‌یەوە ، بە ڕۆژانی دەست‌کورتی‌و هەژاری‌و نەدارایی‌و تێرو تەسەلی‌یەوە ، بە سەردەمێکی بێ‌ئاگایی‌و زەمانێکی وشیاری‌یەوە ، بە دڵ‌رەقی‌و دڵ‌ڕەنجاندنی ئـــەم‌و ئەوو بە ڕۆژانێکی پڕ لە خۆشەویستی‌یەوە ‎٠٠‎ وا ئێستاش بە دڵ‌شکاوی‌و کۆڵێ خەم‌و خەفەتەوە ئەو هەمو یادگارانە لە بوخچەیەکی گرێ‌دراوی خەماوی‌یا لێرە بەجێ‌ئەهێڵم‌و ئەیاندەم بەدەم رووباری دیجلەوە ‎٠٠‎ تازە ئیتر من‌و ئەم شارەیان نەوتوە ‎٠٠‎ مردنیش بێ ئەوێم باشترە » ‎٠‎

ناوپاسەکە لە کەشتیی نووح ئەچوو کە هەموو جۆرە خەڵکێـکی تیابوو ، زوربەیان دوودوو سەریان بەیەکەوە نابوو قسەیان لەگەڵ یەکا ئەکرد ، بەتەنیا تۆ لە گەرداوێکی گەورەدا گیرت‌خواردبوو ، یـــەك دووجاریـش ئـەفەندی‌یـە درێـژەکەی تـەنیشتت ویستی بتهێنێتـــە دوو ، بـەڵام بێ‌سـوود بـوو ‎٠‎ دەستت‌دایـە گۆڤارێـك خـۆتی پێـوە خەریك‌کەی ، لە هەڵدانەوەی پەڕەکانیا وێنەیەك سەرنجی ڕاکێشای ، تەزوویەك بەدڵتا هات ، وێنەی خێزانێـك لەسەر خوانـی نان‌خـواردن کرابوو بە سەرپەڕەی چیرۆکێك « خێزانی ئێمە سەرپەڕەی چیرۆکێکی پڕناسۆر بوو ، هەورازێکی سەختی لەم ژیانە دژوارەدا بە کڵۆڵی بڕی ، دایکم قوربانی بە خۆی داو لە هەڕەتی جوانییا دەستی بەسەرا گرتین ،

خوشکەکانم بەرودوا وازیان لە خوێندن هێناو چوونە سەر کار تا بتوانین بە سەربەرزی بژینو تانەو تەشەری ئەمو ئەو نەهێنینە سەر خۆمان »

* * *

پەڕەیەکی‌ترت لە گۆڤـارەکە هەڵدایەوە وێنـەی زاواو بووکێـکی تیابوو ، وەك یادگارێکی خۆش ئەورۆژەت بییر کەوتەوە کە خوشکـە گەورەکەت شووی‌کرد ، تۆ هێشتا لە قۆناغی خوێندنی ناوەندیدا بووی ، لەلایەك دڵخۆش‌بووی ، لە لایەکی‌تریشەوە بییرت لەوە ئەکردەوە کـە لێتان دوورئەکەوێتەوە « دوورکەوتنەوەو لێك‌دابـڕان بـۆ کاری خۆش شتێکی سـتەم نی‌یـە • گەیشتمـە یەکـەم پلـەی زانسـتگا خوشـکە ناونجی‌یەکەشم شووی‌کرد • ماینەوە منو سیروانی برامو دایکم ، ئێمەش خوێندنمان تەواوکرد • دووساڵ پێش دەرچوونی من سیروان دامەزرا ، دایکم زۆر بەختیار بوو کەوا دوو کچی حەساونەتەوەو ، تاقە کوڕەکەشی لە خەم رەخساوە • ئاواتی ئەوەبوو ئەویش ژن‌بهێنێ ••• بەڵام ئەوەندەی هەستم پێ‌کردبێ مـن لـەلای شتـێکی گرنـگ نـەبووم ، وەك گرێی سەرەخۆری‌یەکەم هێشتا هەر لە دەروونیا پەنگی خواردبێتەوە وابوو » •

— ئەوە خوشکێ چی ئەخوێنیتەوە ؟

دەنگی کابرا درێژەکەی تەنیشتت بەئاگای هێنایتەوە •

— ئەم چیرۆکە ئەخوێنمەوە •

بە بێ‌ئاگایی گۆڤارەکەت پێچایەوە تا هەست بە شپرزەییت نەکا ، چونکە تۆ لەودەمەدا لە چیرۆکەکەدا نەبووی ، سەیری بووكو زاوای ناو گۆڤارەکەت ئەکرد ، پیـاوەکە هەنـدێ لەسەر سـوودی زانستو لێکۆڵینەوەو بێ‌بایەخی ئەم جۆرە بابەتانەی‌تر دوا ، بەڵام تۆ نەت‌ئەویست

زنجیرەی بیرەوەری‌یەکانت بپسێ ، بەدڵ ئەتویست لە ڕۆژانی رابوردوتا بژیت ، هەر هیچ نەبێ کەمێك لە خەمو ئازارەکانی ئێستات کەم بکاتەوە ، کچێك لە ڕیزی ئەوبەرتەوە بە کچەکەی تەنیشتی ووت :
تۆ ئەزانی ( رۆژە ) خوازبێنی کراوە •

« چەندجارێك خوازبێنی‌کرام ، بەڵام بە هیچیان قایل نەبووم ، هەستم ئەکرد هیچ یەکیکیان ئەوە نی‌یە کە من ئەمەوێ ، لەراستیشما خۆشم نەم‌ئەزانی من بەدوای چیدا وێلم ؟ چجۆرە مرۆڤێك ئەتوانێ پانتاییی دڵم پڕبکاتەوەو هیواو ئاواتم بهێنێتەدی » •

دەنگی دوو کچەکە ئەمجارەش خەیاڵەکەیان لێ ئاڵۆزاندیت •
ئەوی‌تریان بە دەستەخوشکەکەی ووت :

— رۆژە لووتی بە هەموو کەسێکدا نەئەژەند ، بەرز ئەفڕی !

« ئەشێ بە منیشیان وا ووتبێ ، هەرچەند لای من مەسەلە بەرز فڕین نەبوو ، بڕوام بە خۆشەویستی نەبوو ، ماوەیەکیش هەروەك بەسەرمابێ ئەمەویست یاری بە دڵی چەند کەسێك بکەم ، بەڵام زوو هاتمەوە سەر خۆمو وازم لەوجۆرە یاری‌یانەش هێنا ••• دانی پیا ئەنیم، لێکدانەوەیەکی ووردم نەبوو ، دایکیشم هەندێ‌جار هەر بە چاوی مناڵە سەرەخۆرەکەی جاران سەیری‌ئەکردمو هەندێ‌جاریش ئەیەویست تۆڵەی ئەشکەنجەو ئازاری مناڵیم بۆ بکاتەوە ، لەگەڵ سیروانیشا وەك دوو ئاوەڵی خۆشەویست هەڵس‌وکەوتمان ئەکرد ، لەبەرئەوەی تەنیا دووساڵ لە من گەورەتر بوو ، بۆیە هیچمان لێك‌نەئەشاردەوە » •

کابرایەکی بەرگ‌زەرد هەواڵی کاتی لە کەبرای تەنیشتی ئەپرسی •

« کات ، ئەو سەردەمە لای من نرخی نەبوو ، نە وەختم هەبوو نە ناوەخت ! دوای تەواوبوونی دەوام کە ئەهاتمەماڵەوە ، وەك جاری جاران هەرچی ئیشی ماڵەکە هەبوو بەجێم ئەهێنا » •

بەرەبەرە بیرت چووەوە حەوش‌و ماڵەکەتان ، گسك‌دان ، کاشی‌سڕین ، قاپ‌شتن ، چێشت‌لێنان ، ئیشی هەویرکردن •

« ئەمجا کە سەعاتی قەد دیواری هۆڵەکە بە کووکوو سێ‌جاری ئەخوێند پەردەی پەنجەرەکانم دائەدایەوە ، کەمێك بەرامبەر بە مێزی ئارایشتەکە سەیری خۆمم ئەکرد ، لەدواییدا لەسەر جێگاکەم ڕائەکشام‌و خۆم ئەدایە دەست فریشتەی خەو » •

مناڵە نازدارەکەی ناو پاسەکە هەندێ لە دایك‌و باوکەکەی دوورکەوتەوە• چەند هەنگاوێك‌و تاسەیەك ڕەوتی لێ تێك‌داو خلیسکا ، لەگەڵ گریانە بەکوڵەکەیا دایکی بەپەلە خۆی کوتا :

ـــ هەی دایکت بمرێ یاخوا ، کوێربم ! کوێت ئازاری گەیشت لەدەوری گەڕێم •

« مردنی دایکم زامێکی گەورە بوو ، زۆر لەناکاو بوو ، لەبەرئەوەی کە ماوەیەکی زۆرمان ژیان پێکەوە بەسەربردبوو ، ئەو کۆچە ناوادەیەی گرمۆڵەی کردم ، پاش تەواوبوونی پرسە خوشکانم هەریەکەیان چوونەوە ماڵ‌و مێردی خۆیان ، بەتەنیا من‌و سیروان بەدیار یادگارەکانی دایکمەوە دۆش دامابووین ••• زۆر جار خەمێکی قووڵ لەناخمەوە سەری هەڵئەدا کە ئەم‌بینی ئیتر جگە لە سیروان کەسی‌ترم نی‌یە پەنای بۆ بەرم » •

ـــ دەی دەی چاوەکانت بسڕە ، هیچ نی‌یە ، ئافەرین ، تۆ ئازای •

باوكی مناڵەكە بەموشانە كوڕەكەی ژیرئەكـ دەوە ، تـۆش هەستت‌كرد چەند دڵۆپێك فرمێسك وورد وورد لە چاوەكانت دێنـە خوارێ ، دەستت بـەرز كـردەوە بـە پەنجەكانـت سڕیـتن « چەنـد فەرامۆشی‌یە مرۆڤ دڵسۆزی وای ببێ فرمێسكەكانی بۆ بسڕێتەوە ، لـە جیهانی خەمو خەفەت رزگاری‌كاو هەوڵبدات زەردەخەنە بهێنێتەوە سەر لێوە خەمبارەكانی » •

یەكێ لە كچەكانی ناو پاسەكە پێكەنینە گەرموگوڕەكەی بەوناوەدا پەخش‌كرد • مەمكۆڵە بچكۆلەكانی لەگەڵ پێكەنینەكەیا كەوتنە جۆلانە ،

« دەمێ‌بوو پێكەنینم لێ تۆرابوو ، بەدەم خەمی ماڵئاوایی دایكمەوە ئەتلامەوە كە رۆژێ لەرۆژان فریشتەیەكم بۆ ڕەخسا بۆ یەكەمجـار بزەی خستەوە سەر لێوەكانم •

وەك ئێستا دێتەوە بیرت كە سیروان ئەو نیوەڕۆیە هاوڕێ‌یەكـی لەگەڵ خۆیا هێنایەوە ، هەر لەدوورەوە بانگی‌كردیت :

ــ ( نیان ) ، ئەوە ( شوان )ی برادەرمە ، چەندجارێك باسیم بـۆ كردووی یەكێكە لە برادەرە هەرە ئازیزەكانم •

بەخێرهاتنت كرد ، دەستت بۆ دەستی برد ، كەمێك پەنجەكانـت لەناو دەستیا سەرخەویان شكاند ، فـەرمووت لـێ كـرد ، دانیشت ، خواردنت ئامادەكرد ، سێ‌قۆڵی پێـكەوە نانـتان خـوارد ، لـەو یەكەم دانیشتنەتانا وات هەست‌كرد كە لەمێژە ئەیناسیی : لەسەرخۆ ، هێمن ، زیرەك ، قسەخۆش ، بەرێز ، ئەو ڕەوشتانەی هەریەكەیان جـۆرە كارێكیان تێ‌كردی ، هاندەر بوون كە زۆر زوو بچێتە دڵەوە •

دیسان كچەكانی ڕیزی ئەوبەرنەوە قسەكانیان تێكەڵ بە شریتـە

سینەمایی‌یەکەی مێشکت بوون ، دیمەنی یادگارەکانت لە بەرچاوت وەك وێنەیەکی تەماوی‌یان لێ‌هات ، کچە دەم‌بەپێکەنینە کوڵم‌ئاڵەکەیان ووتی :

— ڕۆژە ، دنیای بەرکلکان دابوو ، کەم شت هەبوو بەدڵی بێ ، وەك کراس بگۆڕێ ، دۆست‌و هاوڕێشی وا زوو ئەگۆڕی ، هەمیشـە هەر پێ‌ئەکەنی ...

« پێ‌کەنین ...! ئەم پێکەنینە لای من یادێکی زۆر شیرینی هەیە ، دوای ئەو هاتنەی شوان بۆ ماڵمان بە چەند ڕۆژێك ئێوارەیەك بەڕێکەوت لە مەنسوور پێك‌گەیشتین . چاوێکی بە جلە ڕەشەکانما خشاند ، نیگای چاوەکانی بڕی‌یە دەم‌وچاوم ئەمجا ووتی :

— نیان خـان ، پێ‌بـکەنە ... مەهێڵـە خەم‌و خەفـەت ئەو لێوانەت هەڵبزرکێنێ ، ئەزانی زەردەخەنەکەت چەند جوانە !

— . . . . . . .

— لە کتێبێکدا خوێندوومەتەوە کە یەکێ لەو هۆیانەی بوونە هۆی کوشتنی شاعیرێکی ئەوروپایی ئەوەبوو : لە یەکەم گرتنیەوە ، تا ئازاردانی، تا هەڵواسینی ، تا پرس‌و لێکۆڵینەوە ، تا بەستنـەوە لە ژێـرزەمینی پیس‌و ساردا ، تەنانـەت لـە دادگاو لەکاتێکیشـدا ڕووبـەڕووی سێدارە کرایـەوە ، ئـەو زەردەخەنەیـەی لەسـەر لێوەکانـی نەخش‌بوون تا تروسکایی لە ژیانیا ما نەکوژایەوە .

— جا ئەتەوێ منیش وابم !

— ئەمەوێ پێ‌بکەنی ، خەم‌و خەفەت هیچ شتێ ناگەڕێنێتەوە » .

★ ★ ★

لەورۆژە بەدواوە ، بەرە بەرە ئەهاتیتەوە سەر خۆت ، بەرەو جیهانێکی نوێ هەنگاوت ئەنا ••• سەردانەکانی « شوان » زیادی کرد ، یەکتریتان زۆرتر ئەبینی •• فوکس‌واگۆنێکی بچکۆلەی هەبوو ، زوربەی ئێواران ئەهات بەدوای سیروانا جارجارەش کە ئیشی تایبەتی‌یان نەبوایە، بۆ گەڕان‌و پیاسەکردنێ تۆشیان ئەبرد ، واتان لێ‌هات خۆشەویستی لە چاوەکانتانا وەك کتێبی کراوە ئەخوێنرایەوە ، لێك ئاشکرابوون ، زمانتان پڕا ، لەوکاتانەدا ئەتوت « خۆزگە زووتر بمناسیایە ، سەرنجم بەرامبەر بە ژیان ئەگۆڕاو بە جۆرێکی‌تر بیرم‌ئەکردەوە »

کچەکان کەوتنەوە گفتوگۆ ئەوەی لای چەپیان ووتی :

— نازانم لەئەنجاما رۆژە چۆن بەو کوڕە قاییل بوو سەرم سوڕماوە •

« منیش سەرم سوڕمابوو چۆن شوانە توانی بەو ماوە کەمە ئاوا کارم‌تێ‌بکا • ببێتە خەون‌و خۆراکی گیانم ، بەشێوەیەك ئالوودەی ببووم ئەوەی نەیناسینایە وای‌ئەزانی دە ساڵ پترە یەکتریمان خۆش‌دەوێ ، هەرچەندە خۆی لەو جۆرە کەسانە بوو کە زوو ئەچوە دڵەوە ، بەڵام لە دڵی منا بەتەنیا هەر خۆشەویستی نەبوو ، ببوە نمونەی هەرە بەرزی ئامانج‌و ئاواتم • کە بەیەك‌ئەگەیشتین بێ‌ووچان بۆ یەکتر ئەدواین ، تێرمان لە ووشەی یەك نەئەخوارد ، بەشێوەیەك خۆشم‌ئەویست ، گیانم ، هۆشم ، هەستم ، هەمووی ئالوودەی ووشەکانی ببوون • »

دەنگی پیاوەکەی لاتەوە ئەم‌جارەش زنجیرەی یادگارەکانی پساندی ، وای‌ئەزانی تۆ هەر خەریکی خوێندنەوەی چیرۆکی ناو گۆڤارەکەیت ، ئاگاداری ئەوە نەبوو تۆ لە چیرۆکی ژیانی خۆتا نوقم‌بوویت ، بۆیە پێی‌ووتی :

ــ وادیارە زۆر حەز لە خوێندنەوە دەکەیت ! خۆ رووناکبیرکردن بۆ ئافرەت کارێکی پەسندە •

ــ بەڵێ ، ئارەزووی خوێندنەوەم هەیە •

« شوان فێری خوێندنەوەی کردم •• من لە سەرەتادا ئەمەویست بمکات بە ئەستێرەیەك لەتەنیشتیا بدرەوشێمەوە ، بە جووتە بکشێین تا لە چاوی هەموو خەڵکی وونبەبین ، بەڵام ئەوبەرەو ژیانێکی نوێـــی ئەبردم ، وای لێکردم چێژ لە خوێندنەوە وەرگرم ، فێری خۆشەویستی ڕاستەقینەی کردم ، ئەو ترس و لەرزەی لە منالی‌یەوە سەردڵمی سمیبوو بە ووشە جوانەکانی ڕەوی‌یەوە ، هەموو هەفتەیەك کتێبێکی بۆ ئەهێنام ، هەر گۆڤارێکی ئەدەبی دەرچوایە خێرا بۆی پەیدائەکردم » •

★ ★ ★

جارێــکیان لە خوێندنەوەی رۆمانێکی « جورج ئامادو »دا کەمێــك کەمتەرخەمیت کردبوو کە هاتەلات پێی‌ووتی :

ــ گۆستاف فلوبیر ئەناسی ؟

ــ نــەء •

ــ نووسەری مەدام « بۆڤاری »

ــ فلیمەکەیم دیوە •

ــ ئەو نووسەرە لە نامەیەکیا بۆ دڵدارەکەی نوسیبوو پێی‌وتبوو :

هیچ زاناو توێژەرەوەیێ بەوە قایل نابێ کە چەند کتیبێ بخوێنیتەوەو ئیتر پاڵی لێبداتەوە ، ئەبێ زۆر بخوێنیتەوەو باشیش بخوینیتەوە •

★ ★ ★

ئەو سەردەمە بۆت دەرکەوت کە بۆچی لەمەوبەر ئەم هاوڕێیەی

سیروانی برات نەناسیوە • زانیت ( گۆرکی ) وتەنی لە « ئێزگەیەکی حەوانەوەی سەفەری سەختی ئەم ژیانە تفتو تاڵـە » بوە ، ئەورۆژەی بەمەت زانی عەسرەکەی لە ماڵی ئێوە بوو گوێتان لە دەنگ‌وباس ئەگرت، کە شوان گوێی لە رادیۆکەدا لێ‌بوو بـاسی جیهانـی سی‌یەم‌و ووڵاتـە بێ‌لایەنەکانی ئەکرد ، ووتی :

— سەیرە ، ئەی بۆ کەسێ نی‌یە باسی جیهانی چوارەم بکات ، جیهانی بێ‌خاوەن • سیروان بە زەردەخەنەیەکەوە ووتی :

— ئەم زاراوەیە تازەیە ، مەبەست چی‌یە ؟

تۆش هەروا گوێت لێ ئەگرتن کە شوان ووتی :

— لە جیهانی چوارەما دەنگی دڵی سەربـڕاو لـە نانـی سەرسـنگی هەتیوەکانا بەرزئەبێتـەوە ، شـارە شەو ووشـکەکانی چاوەڕێـی تروسکایی‌یەکی رۆژن رووناکیان بکاتەوە •

— بەڵام لەبیرت‌نەچێ ئەوشەوە ووشکانە لە چاوی نەوە نوێ‌کانیانـا دائەگیرسێ • کە گوێت لەم ووشەیەی سیروان بوو هەر لەخۆتەوە موچڕکەیەکت پیا هات بەڵام پێش‌ئەوەی چی‌تر بیربکەیتەوە ، شوان ووتـی :

— کاك سیروان مەسەلەکە ترسە ، ترس وەك مۆتەکە سواری سنگی خەڵکەکە بوە ، دڕندانە کەوتۆتە هەڵکۆڵینی ، کێڵگەکان ووشك‌و برنگن ، کانیاوەکانیان •••

برێك گرتنی شوفێرەکە ڕای‌چلەکاندی ، ئەو شریتەی لە بەرچاوت بوو لێڵ‌کرا • خەڵکەکەدەستیان بە دابەزین کرد ، ئەمە نیوەی رێگاتانەو کاتی نان‌خواردن‌و حەوانەوەیە ، لە دابەزینەکەتا دەم‌رووتێك پلارێکی

تێ گرتی ، بەڵام تۆ لە بارو دۆخێکی دەروونی وەهادا نەبووی تەنانەت وەڵامێکی ڕەقیشی بدەیتەوە ، بە لالووتێکەوە ڕووت لێ وەرگێڕا وەك تیلیکس ووشەیەکی شوان بە بەردەمتا بەچاپ کراوی ئەهات‌وئەچوو •

— ئەبێ هەمیشە چیایەکی سەخت بیو لە گرتن نەیەیت •

« ڕاستی‌یەکەی وابووم ، لەوەش زیاتر بووم ، هەرواش ئەبم • بەڵام بەرامبەر بە شوان زۆر بێ‌هێز بووم ، جارەها پێم‌ئەوت : لەوپەڕی دنیاش بی هەر لەتەکتا ئەبم ، بچیتە سەر ترۆپکی بڵندترین چیای کوردستان پیایا هەڵئەزنێم‌و ئەتگەمێ » •

لەو دابەزینەدا خەڵکەکە هەڵپەی نان‌خواردن‌و ساردی خواردنەوەیان بوو ، تۆ دڵت گوشرابوو ، خۆشترین خواردەمەنی ئەم تام‌و بۆن‌و بەرامەیەی لەلات نەبوو ، تا وات لێ بکا ئارەزووت بچیتە سەری ، سەرت دەیەشا ویستت چایەك بخۆیتەوە، لە چاوەجاخی چایچیەکە کە نزیك بوویتەوە ، کابرا لە هەڵپەو پەلەپەلیا سەری نەئەپەرژا قۆری‌یەکە لەسەر ئاگرەکە لاببا وەك سینەمەکی ئەکولا ، تۆش لەناخەوە لە چایەکە زیاتر ئەکولای ، خوێن لە زاری زامەکانتەوە هەڵئەقولاو کەسیش پێی نەئەزانیت ، پیاڵەیەك چات خواردەوە ، هاتیتە دەرەوەی چاخانەکە ، چاوت بە درەختێکی تەنیا کەوت بیرت‌هاتەوە ئێوارەیەك لەگەڵ شوانا دەمەدەمی پاییز بوو بەلای کۆمەڵە درەختێکا هاتن پاییزەبا گەڵازەردەکانی بەیەکائەدا ، دەستی بۆ گەڵایەك برد کە سەوزایی لێ بڕابوو پێی‌ووتی :

— نیان ، هەموو وەرزێك هەر خەزان نی‌یە ، ئەبێ لەوباوەڕەدا بی کە ئەم درەختە ووشکە جارێکی کە گەڵائەکاتەوەو سەوزو جوانیش ئەبێتەوە •

لەکاتـی سەرکەوتنەوەتـدا کچێـکی ئیسکسووك هاتەلاتـەوە پێی ووتی :

ــ وا هەستئەکەم زۆر بێتاقەتی ، من لەگەڵ باوکمام ، وادیارە ئەو پیاوە کە لەتەنیشتتەوەیە ناسیاوت نییە ، با باوکم بچێتە شوێنەکەی تۆو تۆش وەرە لای منەوە •

پێشنیازەکەیت بەدڵ بوو ، جێتان گۆڕیەوە ، کچەکە ئەیەویست پەردەی بێدەنگییەکە بدڕێنێ ، هەستیکرد هەوری بێئارامی لە پێڵـوی چاوەکانتا وەنەوز ئەدات ، پاش چەنـد ووشەیەکـی ئاسایـی بەرەبەرە چاوەکانی نیشتن خەوی لێکەوت ، سەری لە سنگت نزیککردبوەوە ، خۆت نەجووڵاند ویستت خەوەکەی لێ تێکنەدەی « رۆژانی رابووردووم بوون بە خەون ، ئەو خەونانەی جارێکیتر نایانبینمەوە •• جارەها ئاوا سەرم ئەکردە سەر سنگی شوانو ڕازی دڵی خۆمم بۆ هەڵدەڕشت • لـە زەردەخەنەکەیا تیشکی بەیانێکی تازەم بەدیئـەکرد ، لـە ووشەکانیـا بڕوایەکی نوێ لەناخما چەکەرەی ئەکرد ••• بڕوام زۆر پێی بەتـین بوو ••• »

ــ باوکی کچە ئیسکسووکەکە ، بە باوکو دایکی منالەکەی ووت :

ــ ئەوە ئەو منالەتان بۆ وا بەندکـردووە ، بـا بـگەڕێ بـۆ خۆی ، لێیگەڕێن با سەربەست بێ •

« سەربەستی لە نانو ئاو پێویستترە ••• بـەڵام کـە سەربەستی زەوتکرا ، زۆرکەس لەپێناوی بەدیهێنانیا ئەچنە بەندیخانەوە »

ئەم ووتەیەی « شوان »ت بیرکەوتەوە ، ئەو ئێوارەیەی خوازبێنی لە سیروانی برات کرد ، مشتومڕێکیان لەنێوانا بوو لەسەر هەندێ لەو

مەسەلانەی زۆرجار رووناکبیران لەناو خۆیانا هەریەکەیان بە بۆچوونی خۆی لێکی ئەداتەوە •

« شوان » ئەو ئێوارەیە زیاتر لەو مەسەلەیە دوا ووتی :

— لەڕاستیشا بەندیخانە ئەوە نییە پیاو کە لەسەر حەق بوو لێی بترسێت ، بەپێچەوانەوە من لەلای خۆمەوە بەشوێنی قاڵبوونی ئەزانم ، دەیان برادەری تازەی تێدا ئەناسی ، هاوڕێیوا کە ڕۆژە سەختەکانی ناو ئەو چوار دیوارەت بۆ ئەکەن بە ڕۆژێکی ئاسایی •

سیروانیش بە پێکەنینەکەی خۆیەوە ووتی •

— کاکیبرا ، گرتن تا گرتن جیاوازی هەیە ، هەندێجار کە تووشی شوێنی وا دژوار ئەبیت ئەوانەی پێشوو لاتئەبن بە زەڵاتە •

شوان بزەیەك گرتیو بە سیروانی ووت :

— ئەوە لە چ کتێبێکدا خویندوتەتەوە ؟

ئەوڕۆژەی گوێت لەم گفتوگۆیە بوو ترسێکی زۆرت لی نیشت، ئەو شەوە کە ئەبوایە شەوی بەختیاریت بێ ، شەوێ بێ ئاواتە گەورەکانی دڵت سەوز بن ، کە بە بێهیچ کۆسپێ بوویتە دەزگیرانی شوان ، کەچی ئەوشەوە خەوت لێ زڕا ، بیرت لەو ووشانەیان ئەکردەوە کە لەتواناتا نەبوو شتێ لە رووی هیچکامیانا بدرکێنی •

★ ★ ★

— بەخوا رۆژێکی گەرمە ، خۆ من ئەو تاوە دابەزیم بۆ نانخواردن وەختەبوو بپرووکێم •

باوکی کچەکە ئەوەی‌وت‌و پیاوە درێژەکەش ووتی :

— بەس‌نی‌یە ناو ماشێنەکە فێنکە ئەگینا گەرما شەکەتی ئەکردیـــن •

« گەرمای هاوینی پارو ووشکە سەرمای زستانی رابوردوو بوون بە ئاشنای هەمیشەییم ، هەرگیز ئەو ئێوارەیەم لەبیرناچێتەوە کە بەجووتـــە چوونە دەرەوەو هاتنەوەیان نەبـــوو ، لە هەرلایـــەك هەواڵـــم ئەپرسین دەم‌وچاویان لێ ئەکردم بە نیشانەی پرسیار، بێ‌سەروشوێن بوون • پاش چەند رۆژێ لە چۆڵەوانی‌یەك ئوتومبیلەکەی « شوان » دۆزرایەوە ، ئیتر هەر شوێنێ سووسەیەکی لێ بکرایە خۆمم ئەگەیاندێ تا هەواڵێکیان بزانم •• بەڵام هەواڵ لە من بوو بە دەرمانـــی شیرپەنجـــەو دەستگیرم نەبوو » •

ئەوەندە بەدویانا گەڕای •• هەستت‌ئەکرد بنی‌پێت خەریکە شەقار شەقار ئەبێ • کە ئەگەڕایتەوە ماڵە چۆڵ‌و هۆڵەکەت لە پەل‌وپۆ ئەکەوتی، جارەها وەك لەهۆش خۆ چوو خۆت بەسەر جێگاکەتا ئەدا ، نینۆکەکانت لە پشتیەکە گیر ئەکرد ، ئەتەویست بیدڕێنی ، لەودەمەدا کە بەتەواوی تواناو هێزت لێ ئەبڕا چەندەها چەقۆی تیژ بەرئەبوونە لەشت‌و ناوسکتیان هەڵئەدڕی ، دەستی دەستیت زۆر پێ‌کرا ، تۆپێکی باڵە بوویت‌و ئـــەم بۆ ئەوی‌تری هەڵئەدای ، بەڵام کۆڵت‌نەدا ، وەڕزنەبـــووی • لەلایـــەك ڕاوئەنرای، لە لایەکی‌ترەوە سەرت‌هەڵئەداو ئەکەوتیتەوە سۆراخیان•••

« براکەم ، دەزگیرانەکەم » رۆژی چەند جارێ ئـــەم دوو ووشـــەیەت بەگوێی خەڵکیدا ئەدا ، سوور بووی لەسەر دۆزینەوەیان ، پاش ئــــەم شارەوشارو دوای ئەم‌بەرو ئەوبەر بە نائومیـــدی ئەگەڕایتـــەوە ماڵەکەت بە تاقی تەنیا •

بەرامبەر بە وێنە گەورەکەی « سیروان » ئەوەستای ئەمجـــا ئەچوویتە ژوورەکەی خۆت تێر سەرنجت ئەدایە وێنـــە دووقۆڵی‌یەکەی

خۆت‌و شوان ، هەستت ئەکرد حەپەساوی مێژەلاکی سەرت کون‌دەکات ، ئەمجا بە شەکەتی لەسەر جێگاکەت ڕائەکشای وەك تادار لەوژوورەداو بەتەنیا ئەکەوتیتە وڕێنە •• بـۆ ڕۆژی دوایـی جارێـکی‌تر ئەکەوتیتـەوە پشکنین ، لە بازنەیەکی داخراوا ئەسووڕایتەوە •• بەهیوا ئەژیایت•لەگەڵ هەموو ئەمانەشا ورەت بەرز بوو •• تا وات‌لێ‌هات هەموو مۆڵەتەکانـت تەواوبوون ، ئەمجا مۆڵەتی نەخۆشی ، تـا ئەویـش لـە ووزەوا نـەما ، لەوماوەیەدا چەند جارێ خوشکەکانت‌و زاواکانت بۆ یاریـدەت‌و بـۆ هەوڵ‌دانی بێ‌هوودە بەدەنگ ئەو کۆستە گەورەیەتانەوە هاتن ، لەئەنجاما داوایان لێ کردی واز لە چۆڵ‌پەرستی بهێنی‌و بچیتـە لای یەکێکیان ، بەلام تۆ سەرەڕای ئەوەی هیوات نەبڕیبوو ، دڵت بەوەوە نەبوو بچیتـە لای هیچیان ، تا ئەوساتەی خورپە گەورەکە لە پەڕەی دڵتی دا ، دڵنیایان کردی کە تازە ئیتر نایانبینیتەوە •

هەر تۆش نەبووی بەتەنیا کە وێڵی دۆزینەوەی ئازیزان بـووی ، هاودەردت زۆربـوون ••• ئـەمجا بـەناچـاری بڕیاری کـۆچت‌دا ، ئەوشەوەیان لەو شەوە درێژانە بـوو کە کۆتایی نـەئەهات ، چاوت بـە ژوورەکانا ئەگێڕاو بۆنی دوا یادگاری ماڵەکەت ئەکرد ، لەم‌لاشەوە بیرت لە دوارۆژی خۆت ئەکردەوە ، ئاخـۆ ئیتر چـۆن ژیان بەسـەربەری ؟ کتێبەکانی شوان کە لەلای تۆمابوون لەگەڵ چەند نامەیەکی‌و ڕۆژژمێرەکەیا ئەمجا ئەلبومەکانی سیروان‌و هەندی شتێ تایبەتی خۆت،هەموویانت خستە جانتایـەکەوە ••• بەیانی کە بـۆ دواجار ماڵاواییت لـە یادگـارەکانی رابوردووت کرد کلیلەکانت بە ماڵە دراوسێکەتان داو پێت‌ووت : بەم‌زوانە ئەنێرم بۆ کەل‌وپەلی ناوماڵەکەمان • خۆشت بە جانتاکەتەوە ڕووەو گەراجە گەورەکە ملی‌ڕێگات گرت •

تۆ لەناخەوە لەم بیرەوەری‌یانەتا ئەژیای دەنگی منداڵە بچکـۆڵەکـە

رای چڵەکاندی کە بە دایکی ئەووت : دایە گیان تینوومە •

« لەکاتی تینویەتیما ئارەزووم بوو ووشەکانی شـوان بخۆمـەوە ، تاتینویەتیم پێیان بشکێ ، بەڵام ئێستا هیچ شتێ نیە دەمم پاراو بـکات ، وا بۆساڵێك ئەچێ هەر زوخاو ئەنۆشم ، لە گەرداوێکی شێتا سـەوڵم لێداو نەگەیشتمە ڕۆخی دڵنیایی هەموو هەوڵێکم بێسوود بوو » •

★ ★ ★

ـــ شوانە گیان وا گەیشتین • ئەوە باخەکانی قەراخ شارن • ئەمنـاوە جارێکی تریش هەژاندیتی ، وەك شۆڕەبی هاتیتە لەرینەوە ، نەتزانیبـوو کە ئەو مناڵە بچکۆلەیەی ناوپاسەکە ناوی شوانە ، وا دایـکی مـوژدەی نزیكبوونەوەی ئەداتێ • گەیشتنە گەراجی شاری تازەت کە ٢٥ سـاڵە مەگەر بە سەردان ساڵەوساڵ سەرتدابێ ، چاوێـکت بـەملاولادا گێڕا ، تاکسی یەکت گرت بۆ هەوارگەی تازەت ببا ، کە سەیرێـکی ئـەملاولای شەقامەکەت کرد چەند ووشەیەکی شوانت بیرکەوتەوە کە پێی ئەوتی :

« نیان گیان ، شارەکەمان ئەگەرچی لە ئاسۆوە بۆ ئاسۆ ڕەشپۆشە، بەڵام پەڕەی دڵی سپی‌و بێگەردە ، ڕۆژانی ووشك‌و برنگە ، بەڵام شەوانی تەڕو پاراوە ، ئەو ڕشێنەیەی شەوانی ئەبێتە هۆی فێنك بوونەوەی گڕی دەروونی خەڵـکەکەی ، دڵێناشـ بە شـنەی شەماڵـێك ئەم تـەپوتۆزە ڕائەماڵێ‌و رووی سەوزی جوانی درەختەکانی ئەچریسکێنەوە » •

لە تاکسی یەکە دابەزیت ، ماوەی سەد مەتریکت مابـوو ، ڕێگـای ئۆتۆمبیل نەبوو ، ئەبوایە بە پێ بڕویشتیتایە ، سووك سووك بە جانتاکەی دەستتەوەو جانتا بچکۆلەکەی شانتەوە ، بە نابەدڵی بـەرەو هـەوارگەی تازەت هەنگاوت ئەنا ، ئەو هەوارەی هەرگیز بەبیرتا نەئەهات کە ببێ بـە دوا هەوارگەی ژیانت •

**سلێمانی : کانوونی دووەمی ١٩٨٢**

# درامای دووعەشقی غەمبار

شیعری : محەمەد حسێن هەڵەبجەیی

-١-

ئێوارەیەك ،
چاوی پڕ حەزم لێك بنێم
هەرچی پۆلە وشەی شیعرەكانمە
ئەكوژێنەوەو
لە نێو دڵی غەمبارمدا
هەڵادەژێن ..

-٢-

دەمی ئێواران ،
چی پشكۆی سوورە خواییەكانە
چرپە ئەخەنە گوێ چەمی ناخو
حەزی سەرشێتی كوێستانێك
بە دڵی تینووی دوو گیانی ماندوو ،
ئاشنا ئەكەن ...

-٣-

ئێوارە بوو ،
زەماوەندت بۆ ـ ئەو ـ گێڕا
لەخۆشیانا

« شنروێ » ی من
دەستلەملانی ( گوڵان ) ی رازاوەی تۆ بوو •••

-٤-

ئەی هاوڕێی گریانی بێفرمێسك ،
کێ مەرگی بۆ دەسگیر ئەکرێ ؟
ئەی نازانی
هەردوو نەوەی چیایەکین
تا خەم بەرۆکی دەروونە کلۆڵەکەمان نەگرێ ،
خوا لەگوناهمان خۆش نابێ •••
هەروەك ئاوی روونی سیروان
چاومان فرمێسکی خوێنین نەڕێژێ
لە عەشقی مەزنی بنار ناگەین ••
لە چریکەی گەرووی گڕاوی شاخ ناگەین •••

-٥-

ئێوارە بوو •••
کە ( ئارام ) یان
بەرەو کەناری دەریا برد
ئۆقرەمان لەبەربڕابوو
نەك بۆ کەنار ،
شاڵاومان بۆ دەریاش ئەبرد !

٥ ـ ٣ ـ ١٩٨٣

# من یەخەت ناگرم ..
# بەلام ، لێم زیز مەبە ،
# ئەگەر چەند ڕەخنەیەکت ئاراستە بکەم

**نەوزاد ئەحمەد مەحموود**

من لەوانە نیم خۆیان لە ئـەدەبی کوردیدا بـە پسپۆڕو باڵادەسـت دادەنێن ، بەڵام کە لە دڵی خۆیشمدا ، لەگەڵ خۆم دەکەومە لێکدانەوە ، ناتوانم چاو لەوە بنووقێنم کە زۆر لەوانەی بە باڵادەست‌و پسپۆڕ دراونەتـە قەڵەم‌و ، سەرەڕای ئەوە مامۆستایشمانن ، هێشتاوەکو پێویستیان بەوەیـە نووسینەکانیان بخەنە سەر لەنگەری‌و بێژنگ‌و بۆیان گێژو تەتەڵە بدەن‌و ژاری بەردو پووشی هەڵەی زۆری ڕێزمانی‌و ڕێنووسی‌یان بۆ لێ بکەن .

لە ژمارە ١١ی گۆڤاری ( نووسەری کورد )دا وتارێـکی مامۆستام دوکتۆر ئیحسـان فوئادم خوێنـدەوە بە مەبەسـتی ڕێپیشاندانـی تـازە نووسەرەکانمان نووسیبووی . بەڕاستمە زۆر لە ئامۆژگاری‌یەکانیم بـەدڵ بوو ، بەڵام لەلاوە ئەوەشم تێدا بەدی‌کـرد کـە خۆیشی پێویستی بـە دەسگرۆیی کردنە ، بۆئەوەی هەڵە ڕێزمانی‌یـەکانی ڕاسـت‌بکرێنەوە . جا وا لەگەڵ تکای دڵسـۆزانەمدا لە دوکتـۆری مامۆسـتام کە لێـم زیـز نەبێ ، وەك ئەو ئەو ئەرکە پیرۆزەی بەرانبەر بـە تـازە نووسـەرەکان

لەئەستۆ گرتبوو ، منیش ئەم ئەرکە بچووکە بەرانبەر بەوی بەڕێز لەئەستۆ دەگرم •

(١) « لەم سالأنەی دواییدا هەستم بەوە کرد [ ل ٢٠ ، د ٣ ] » •

دەبوو بیگوتایە : «لەم سالأنی دوایییەدا هەستم بەوە کردووە»، چونکە « هەستم کرد » واتای بەیەکجارو کوتووپڕ دەگەیەنێ ، بەلأم « هەستم کردووە » واتە عەمەلی‌یەتەکە لەسەرەخۆ بووە یا هیچ نەبێ لەپڕ نەبوەو ، ئەوەش لێرەدا مەبەستە •

(٢) « ئەم هەنگاوە گەلێ پێویستو بەجێن [ ل ٢٠ ، د ٥ ] » •

دەبوو بیگوتایە : گەلێ پێویستو بەجێیە » چونکە هەنگاوەکە هەنگاوێکە •

(٣) « لە دلّی خۆما وتم [ ل ٢٠ ، د ٥ ] » •

دەبوو بیگوتایە : « گەلێجار لە دلّی خۆمدا گوتوومە » چونکە ئەم پیرۆزبایی‌یە دەروونی‌یە هەمووجارێ کە بیری لەم مەسەلەیە کردوەتەوە ، ڕووی‌داوەو ، مەسەلەکە تەنها هەستکردنی یەك‌جار نەبوە ، وەك چۆن لە ڕێگایەکدا لووتت بە لووتی کەسێکەوە بتەقێ ، تا وتنەکەش تاقە یەك‌جار بێ •

(٤) « سەربکەوێ ئێمەیش [ ل ٢٠ ، د ٦ ] » •

دەبوو بیگوتایە : « سەربکەوێو ئێمەیش » یا « سەربکەوێ تا ئێمەیش » •

(٥) « هەنگاوبنێین بەرەو پلەی •••• شانۆگەری [ ل ٢٠ ، د ٧-٨] » •

دەبوو بیگوتایە : « بەرەو پلەی ••• شانۆگەری ، هەنگاوبنێین)

چونکە داڕشتنی کوردانەی ڕستە وادەبێ •

(٦) « مەردوم [ ل ٢٠ ، د ١١ و هیی‌تریش ] » •

دەبوو بیگوتایە : « مرۆ ، مـرۆڤ ، ئادەمزاد » چونکە مـەردوم ( کۆ ) دەگەیەنێ واتە ( خەڵك )و لێرەشدا ئەوە پێویستە کە بـڵێ ( بنیادەم ، ئادەمزاد ) • ڕاستیی ئەم بۆچوونەش لەوەدا باشتر دیاریدەدا کە دوکتۆر پاشان دەڵێ : « مەردوم ، تەنها کاتێك لە پلەی هەرزەکاری دەچێتـەدەرێ ، پێی‌دەڵێن : بابە ، بـووە بە پیاوێـکی کامـڵ [ ل ٢٠ ، د ١٢ – ١٣ ] » •

(٧) « لێرەشدا مەبەستم لە واتا حـەرفی‌یە تەنگەبەرەکـەی نی‌یە [ ل ٢٠ ، د ١٤ ] » •

واتا حەرفی‌یە تەنگەبەرەکەی چی ؟ دەبوو ئەو وشەی (پیاوەتی)یە کە زۆر ــ بەپێی شوێن ــ پێشان گوتوویەو پاشانیش لەپاش ئەم ڕستەیـە گوتوویەتەوە ، لەدوای وشەی « تەنگە بەرەکەی » ەوە داینایە ، چونکە سەرچاوەی ڕاناو دەبێ دیار بێ •

(٨) « یەكدەگرنەوە لەسەر ئەوەی [ ل ٢٠ ، د ١٧ ] » •

دەبوو بیگوتایە : « لەسەرئەوە یەكدەگرنـەوە » • خـۆ ئەگەر بیگوتایە : « لەوەدا هاودەنگن » یا « یەکیان‌گرتووە » زۆر کوردانەتـر دەبوو •

(٩) « هەنگاوبنێم بـەرەو پلەی چیرۆكنووسـین [ ل ٢١ ، د ٢١ – ٢٢ ] » •

دەبوو بیگوتایە : « بەرەو پلەی چیرۆكنووسین هەنگاوبنێم » •

(١٠) « بۆیه زیاتر لایەنگیریی بڵاوبوونەوەو گەشەسەندنی ئەم بەرهەمەم یان بڵێین ئەمجۆرە هونەرەم [ ل ٢١ ، د ٩ ـ ١٠ ] » •

ئەو ( بۆیه ) یه زیادە ، چونکە کە لەپێشەوە گوتی : « بەڵام لەبەرئەوەی •• » ئیتر شوێن بۆ ئەم ( بۆیە ) یە نامێنێ • دەشبوو بیگوتایە : « لایەنگیری » نەك « لایەنگیریی » چونکە دوکتۆر ( لایەنگیر ) ە ، ( لایەنگیری ) نییه ، ( لایەنگیری ) کردەوەکەیەتی • هەروا دەشبوو بیگوتایە : « ئەم بەرهەمە » نەك « بەرهەمەم » چونکە کە پاشان ڕاناوی ( م ) ی لەسەر ( هونەرەم ) دانا ، هیچ پێویستییەکی بۆ ( م ) ی پێشوو نەهێشتەوە •

(١١) « ڕوویەکی تایبەتی دەکەمە چیرۆکنووسەکان دەڵێم [ ل ٢١ ، د ١١ ] » •

باشتربوو بیگوتایە : « ڕوویەکی تایبەتی دەکەمە چیرۆکنووسەکانو دەڵێم » • ( دوکتۆر جارێکی‌کەش ئەم جۆرە عەتفی بێ ئامرازی عەتفەی دووبارەکردووەتەوە ) •

(١٢) « ئەگەر لەمساڵەدا هەر منداڵێك لەدایك بێ ئەوە بەختیارە [ ل ٢١ ، د ١٢ ـ ١٣ ] » •

دەبوو بیگوتایە : « هەر منداڵێك لەمساڵەدا لەدایك ببێ ، بەختیارە » چونکە دیارە لەوساڵەدا منداڵ هەر لەدایكدەبێو مەسەلەکە پێویستی بە ( ئەگەر ) نییەو ئەگەر دوکتۆر لەسەر ئەم ( ئەگەر ) ەش هەر سوور بێ ، ئەوە ئیتر ( هەر ) پێویست ناکا ، چونکە لەمحاڵەدا ( یەکێتی ) جێ‌گرتووترە تا ( زۆری ) کە ( هەر ) ەکە دەیگەیەنێ • زیاد لەمە ئەو ( ئەوە ) یەیش پێویست‌ناکا ، چونکە دیارە ( بەختیارە ) تەواوکەری ڕستەکەیەو مەسەلەکەی پێ دەبڕێتەوە •

(١٣) « ساڵی هەزارو .... دەزانن چی دەگەیەنێ ؟ [ ل ٢١ ، د ١٨ ] »٠

دەبوو بیگوتایە : « دەزانن ساڵی هەزارو ... چێ دەگەیەنێ » .

(١٤) « ئەوەندەی پەیوەندیی بە ئێوەوە هەیە [ ل ٢١ ، د ١٩ ] » .

دەبوو بیگوتایە : « ئەوەندەی پێوەندی بە ئێوەوە هەبێ » .

(١٥) « وە نزیکەی سەدو دە ساڵ بەسەر یەکەم شانۆگەریی لە شاری ئەستەمۆڵدا ( ژنهێنانی شاعیر ) دا تێپەڕیوە [ ل ٢٢ ، د ٦-٧ ] »٠

دەبوو بیگوتایە : « نزیکەی سەدو دە ساڵێش بەسەر پیشاندانی یەکەم شانۆگەریدا لە شاری ئەستەمووڵ تێپەڕیوە کە شانۆگەریی ( ژن هێنانی شاعیر ) بووە » .

(١٦) « لە چاوترووکاندنێکدا ببێ بە خەڵووزو خوڵەمیش هەرچی چواردەوریشی هەیە بە سەوزیو ووشکیو بەدرێژایی سەدان کیلۆمەتر ... [ ل ٢٢ ، د ١٢ - ١٣ ] » .

دەبوو بیگوتایە : « ... ببێ بە خەڵووزو خۆڵەمێشو هەموو چواردەوریشی بە سەوزو وشکیەوەو ... » .

(١٧) « لە نیو سەدە کەمتری بێنەچوو [ ل ٢٢ ، د ١٤ - ١٥ ] » .

دەبوو بیگوتایە : « لە ماوەی نیوسەدە کەمتردا » .

(١٨) « لە قەومەکەی لووت خراپتریان بەسەرهات [ ل ٢٢ ، د ١٦ ] »٠

دەبوو بیگوتایە : « دانیشتووانیان لە قەومەکەی لووت خراپتریان بەسەرهات » چونکە شارو دانیشتوانی شار لە یەك جوێن .

(١٩) « حوشترمورغیوا دروستدەکات لە قوتووی هیچ عەتارێکدا نییەو نەبیستراوە [ ل ٢٢ ، د ١٨ - ١٩ ] » .

هەرچەند هەڵەی ڕێزمانی لەم ڕستەیەدا نی‌یەو دەبوو لێی بێ‌دەنگ بوومایە ، هەر بە باشم نەزانی چاو لە هەڵەکانی‌تری بپۆشم ، چونکە بە هەڵەی زلم زانین • یەکەم تائێستا ـ من پێ‌بزانم ـ لە ئیدیۆمی کوردیدا نەبیستراوە حوشتر مورغ لە قوتووی عەتاردا ببێ یا نەبێ • ئەوەی باوە ئەوەتە دەڵێن فلان‌کەس شتی‌وای لا چنگ‌دەکەوێ لە قوتووی هیچ عەتارێکدا نەبێ • سەرەڕای ئەوەش کە بیستران هەر لەئارادا نی‌یەو تەنها ( بوون ) ە •

(٢٠) « بەزمی خۆیان گەرم‌کردو [ ل ٢٣ ، د ٢ ] » •

دەبوو بیگوتایە : « بەزمی خۆیان گەرم‌کردووەو » بەپێی ڕستەکانی پێشەوەی •

(٢١) « ئەم ڕووداوە ساکارو بێ‌تامو گەوجو گێلانە چی‌یە کە لە ڕاپۆرتێکی ڕۆژنامەچی‌یەکی تازەکوورە دەچێ [ل ٢٣ ، د ١٤ ـ١٥] »•

دەبوو لەجیاتیی « چی‌یە » و « دەچێ » بیگوتایە « چین » و « دەچن » ، جگە لەوەش کە ڕووداو بە ( گەوجو گێل ) وەسف‌ناکرێ‌و ، ڕووداوەکانیش لە ڕاپۆرت ناچن ، ئەو چیرۆکانەی ڕووداوەکانیان تێدا گێڕراوەتەوە لە ڕاپۆرتی‌وا دەچن • مادام گوتیشی « ڕۆژنامەچی‌یەکی » ، نەدەبوو لە پێشەوەی بڵێ « ڕاپۆرتێکی » ، بەڵکو دەبوو بیگوتایە « ڕاپۆرتی » •

(٢٢) « ئەم جەلجەلوتی‌یە گرێ‌کوێرانە مەتەڵێکە بە کەس هەڵناهێنرێت [ ل ٢٣ ، د ٢١ ؛ ل ٢٤ ، د ١ ] » •

دەبوو بیگوتایە « مەتەڵێکن بە کەس هەڵناهێنرێن » •

(٢٣) « ڕووی میهرەبانی وەربگێڕم بۆ •• [ ل ٢٤ ، د ٨ ] » •

دەبوو بیگوتایە : « ڕووی میهرەبانی بکەمە •• » •

(٢٤) « بەتکاوە بڵێم [ ل ٢٤ ، د ١٠ ] » •

دەبوو بیگوتایە : « بەتکاوە پێیان بڵێم » یان « تکایان لێ بکەم کە •• » •

(٢٥) با دوارەخنەشم لەو ڕستەیەی دوکتۆر بێ کە دەڵێ : « کە پیر بوو ناتوانێ لافی هەرزەکاری لێبدات ، چونکە ئەگەر بەڕۆژیش ئەمەی جاروبار بۆ بچێتەسەر، شەوی بەسەردا هات وەکوو (حەمدی) دەڵێ مەگەر شمشاڵی بۆ لێبدات دەنا لەجێی خۆی ناجمێ [ ل ٢٤ ، د ٢٠ ـ ٢٣ ] » •

ڕەخنەکەشم ئەوەیە : بۆچی تائێستا مەسەلە مەسەلەی ئەدەبو شیعرو چیرۆك بوو ، یا لەجێیخۆ جمانو نەجمانی شەوانی هینەکەی مرۆ ؟• تۆ بڵێی هەر لەبەرئەمەش بووبێ دوکتۆر لەپێشەوە گوتی خوا وای داناوە « هەر هەرزەکار » بێ ؟ !

---

زەمانە بەعزە کەسانێ لەپڕ کە هەڵدەبڕێ
ئەوەندی هەڵدەبڕێتن هەتا لە کەل دەبڕێ

بە یەك دو کلکە بەرەوژووری بردەوە دنیا ،
بە تاقە نووکەشەقێکی فڕێدەدا لەپڕێ

**مەحوی**

---

# کورتە شیعرەکان

حەسیب قەرەداخی

( ١ ) باران

ساڵێك ئاسمان لەم زەمینە بێتاوانە چوو بەقینا
بارانی لێ گرتینەوە ،
ڕووبارەکان هەڵپڕووکان ،
سەرچاوەکان دەموچاویان چوو بەقووڵا
مەلا بۆ نوێژی ئیستیسقا ڕووی کردە چۆڵ
دارو درەخت بە گەڕەکی کێوەکاندا ،
بووکە بارانەیان ئەبرد .
کەڵکی نەبوو ،
ئاسمان دڵۆپێ بارانی هەر نەباران !
دەنگێ کەوتە کووچەی شاران :
زەوی ئەڵێ
چار نەماوە ، پەنا بەرن بۆ لای هەڵۆ
هەڵۆ ئامان .. هەڵۆ ئامان !
لە هێلانەی بەر کاوەوە چریکاندی ،
شەقەی باڵی بوو بە برووسکەو چەخماخە

له ئاسماندا گیرسایەوە ،
ئاسمانی چی ؟ لەترسانا گرێی یەخەی کرایەوە
هەڵۆم هەڵۆ ،
چنگێکی تیژی وای لێدا ،
سینگ و بەرۆکی وا دڕان
ئیتر باران لێزمەی کرد
تا کەوتینە بارانبڕان ..

## ( ٢ ) ناخی خـۆم

ڕۆژێ ناخی خۆم کردەوە
بەچراوە پیایا گەڕام
لە زۆر جێدا دەستەونەزەر ڕادەوەستام
ئەچوومەوە دۆخی ئیلهام
کە وردئەبوومەوە ئەموت :
بۆ وێرانە ئەو هەڵوێستە ؟
بۆچی خوارە ئەو هەنگاوە ؟ ،
ئەوە کۆچی ئەوینمە ،
سەدان مۆمی شیعرم هەیە ،
بۆ یەکێکیان هەڵنەکراوە ؟
ئەوە جێگەی سووتانمە ،
بۆ پشکۆیەك جێ نەماوە ؟ ! .
ئەوە دەرگای ئازارمە ،
سەرکڵۆمەو خڕ کراوە ،
ئەوە پیشانگەی یادمە ،

نای کەنەوە داخراوە •
کە گەیشتمە نەزەرگەی تۆ بۆ خۆم چەقیم
ئەوساکە چاك تێــگەیشتم ،
تەنها لەبەر تۆیە ئەژیم •

**( ۳ )   لەبیرکردن**

کاتێ ویستم لەبیری کەم ،
بەبیرما هات بیرکەمەوە •••
وەکوو بەهار گوڵێ بگرم بەدەمەوە ،
وەکوو کوردێك بە کۆڵی قورسی خەمەوە ،
وەکوو جۆگەی کەفچەڕێنی
لێو بە قەراخی چەمەوە
وەکوو ( وەلی ) بە عیشقی پاکی ( شەم ) ەوە
بچمەوە لای ،
بمە پەنای
ڕۆژێك ویستم لەبیری کەم
نیهادێکم بێ نەمێنێ
کە بۆن نەما با ، ڕەشەبا ، پەڕەی گوڵان
هەڵوەرێنێ !

**( ٤ )   شــەکاندن**

ئەی کچی جوان ،
ئەگەر بەناو نیگایەکتا
ناخودای (۱) خۆم بڕەتێنم

---

(۱) ناخودا = کەشتیەوان •

بێ گومان بە کە دەتوانم ،
سەری لەخۆبایی بوونت ،
بە ئەستێرەی شیعرەکانم
وەك لقی دار بشەکێنم !

( ٥ ) جەستە

کە ڕوانیم بە جەستەی خۆمدا ،
برینەکان وەکوو گوڵی کراوە بوون ..
خوێنیان دەتکا .
کاتێ ڕوانیمە دوژمنان ،
لەژێر باری ڕقی خەستیان لە ئارامم
پشتیان دەشکا ! .

( ٦ ) تەشەر

هەرچی ئەبینی گیرفانی
پڕ لە تانەو تەشەر ئەکا ..
وەکوو خڕکە بەرد ئەیهاوێ و ،
سەرو گوێلاك ئەکوتێتەوە .
هەرچەند گیزەی تەشەرێك دێ بەلای سەرما ،
ئەڵێم خوایە : ئەم پەتایە ،
چۆن داکەوت و ،
داخۆ بڵێی ببڕێتەوە ؟ !

## ( ٧ ) بیســـمیللا

وتی :

کاروان کەوتە ڕێگا •••

وا لەدواوە تەمەڵەکان تازە بەدوای پشتێنیاندا

وەکوو سۆلسۆلە گڕئەخۆن !

وتم بۆ ناڵێی زۆرزانان ،

تا مەچەکیان لەچێشتایەو ،

دڵیاکەکان تازە « بیسمیللا »

دەست ئەشۆن ؟ !

## ( ٨ ) کوڕە کەچــەڵ

کوڕەکەچەڵی سێبرا ••

هەرچەند ئەڵێیت کوا حیسابم ؟ ! ،

هەمووشتی بۆ ئەوانە ،

تێڵا نەبێ تیلای قورسی برایەتی ••••

کوڕەکەچەڵ بۆ تۆیانە !

---

تۆ کە حۆریت ، وەرە نێو جەننەتی دیدەم ، چدەکەی
لەم دڵەی پڕ شەرەرو سینەیی سۆزانمدا ؟ !

**نالی**

---

# کەڵ بژی

حیسام بەرزنجی

-١-

— دایە دە جووتە کڵاشەکی ئەوهاش بۆ من بچنە •
— راوەستە کوڕم هێشتان مایتت • هەتا باوکت هەبێ تۆ چی ؟
— هەیهوو ••• دایە گیـان •• تۆ هیچ رات لـە من نیـە ، جارێـك شتێکیوام بۆ ناکەی کەیفم بە خۆ بێ لەناو قوتابیان •
— نا ( سەرداره ) کوڕم نا •• ئارامتبێ ••• جارێ بەخێر خوێندنت تەواوکە •• باوکتوانیش هەندەیان نەماوە بگەن بە مەرام ، ئەوجـە هەینێ با باوکت مشووریتان لێ بخواو بەتەنگتانەوە بێ ، بەڵکو منیش بۆخۆم نەختێك دەهەسێمەوە ••• هێسکم لەناوتان سووتا •• نازانم هامار بۆ کامەلا ببەم •• شوانتانم •• گاوانتانم •• جەنجەڕوانتانم ، دایکتانم ، باوکتانم ••• خەمخۆرتانم ••••
— جا منەتی چیمان لەسـەر دەکەیت •• دایکمـان نیت ••؟ ناچـاری بەخێومانکەیت • باوکیشم لە بۆ خۆشی خۆی ئێمەی بەجێنەهێشتووە، ئەویشـی هـەروەك زەلامی گونـدی بە ئەرکی سـەرشانی خـۆی هەڵدەستێ •
— باسی باوکت هەر مـەکە • تۆ سـێ سـاڵان بـووی کـاتی ماڵێی بەجێهێشتوەو بوویتە گورگی باران دیتە ، •

— بەڕاستی دایە ماوەیەکی زۆرە ، خوا قەوەتت بدا •

— ئەدی کوو کوڕم هەر بە قسە خۆشە •• تۆ وا تەمەنت بۆتە حەڤدە ساڵ ، لەهەینێوەڕا ئەو بوویتە میوانی ماڵی خۆی •

— گوێمەدەرێ دایە گیان ، هەر بزانە لە شەوەزەنگێکدا دیسان پەیدابوەوە ، ئەوساکە هەموو خەمو خەفەتمان لەبیر دەچێتەوە •

— خوا بکەم بەمەرگی چنەبێ •• قیڕسی لە من • هەموو جارێ کە دەیبینم ئاگرم تێبەردەبێ •• هەندە لاوازو بێتووکە ! ، بەناو ساڵێش کەوتووە ، تەمەنی خۆی لەو چەرمەسەرییە بردەسەر ••• خوا چاوی ئاغە کۆرە بکا یارەبی •

— بەخوادەنا دایە ئەمجارە بڕیاریانداوە هەتا « مشیراغە » هەموو زەوییەکانیان نەداتەوە شتاقەکیان نایەنەوە •

— کوڕم ، ئەوەی راستی بێ ، مست لە درێشە دەگەڕێتەوە ، ئەگەرنا بەخوای بەخوای ئاغە ئەو قەرسیلی بنمالآنو عاردی جێجۆخینیش لە خەڵکی گوندی دەستێنێتەوە •

— تازە کار لە کار ترازاوە ، وابزانم ئەوجارە مل بە ئاغا کەچدەکەن •

— •• هەموو رۆژێ پێنج فەرزەی خوا لەسەر بەرماڵ دادەنیشمو دووعایان بۆ دەکەم ، هەر دەڵێم خوایە دڵی ئاغای گوندەکەی ئەولا هەروا نەرمکەی ، هەروا پشتیان بگرێو لێیان پەشیمان نەبێتەوە •

— دوێنێ مامۆستاکانم لە قوتابخانە هەر باسی ئەویان دەکرد ، دایە ، دەیانگوت ئەو گەلەك زاڵمترە ، ئەوی پشتی بەوجۆرە کەسانە بەستێ برپرەی پشتی لە ناوەندێڕا هووردو هەڕا دەبێ •

— ئەدیکوو •• ئەرێوەڵلا هەند زالمن •• هەند بێدێنن هەتا خوا دەڵێ بەس • ئەوانە ئەگەر بنە پردیش هەقوایە بەسەریاندا نەپەڕینەوە • بەڵام هەروەك باوکت وتی : ئەمجارە وەك جارەکانی تر

نابێ ، چونکە ئەو دوو شاخە هەردوك دوژمنی یەکن‌و پێی یەکتر دەدزنەوە • ئەگەرنا کوڕم بەخوای ئاغای گوندی ئەولاش هەر جێی ئومێدێ نیە •

-٢-

•• بەهار بوو •• بەرەبەرە سەرماو سۆڵ لەگەڵ بەفری سەرکەل دەڕەویەوە ، دەغڵ‌و کێڵگەکان سەوز دەچوونەوە ، دەغڵ‌ودانەکان‌تازە پنجیان کردبوو ••• ! • « حەمەدەمین سەرکار » قیرپاچێکی لەدەست گرتبوو لەپاش نیوەڕۆیەکی درەنگ دیاربوو بەهەشتاوی بۆ گوندی دەگەڕایەوە •• قەرەبینایەکی لەخۆی بەستابوو دوو خەریتەی راستو چۆپیشی لەخۆی ئاڵاندبوو ، هات لەسیلەی مزگەوتێ مێخزنجیری بارگینی بۆرەی لێ داکوتاو،رووی لە زەلامەکانی بەر سێبەری مزگەوتێ کرد •• ئەوانیش کە چاویان پێی‌کەوت هەموو دڕیان‌داو رێ‌یان بۆ چۆل کرد تاچوو لەلای سەری لێی راوەستا، ئینجا دەستی بە قسان کردو وتی :

— خەڵکینە •• ئێمە هەموو خزمی گوندینە ، خەبەرێکم لایە ئێستا بۆتان باس‌دەکەم ، جا بەگوێی مـن بکەن باشترە لە یەکەکی بێگانە •••• ! • هەموو ئەوی کوڕی یان برای یاخود خزم‌و کەسی لە گوندی چوویتە دەرێ‌و سەرپێچیان لە فەرمانی ئاغا کردووە •• بڕۆنە دوویان‌و بیانهێننەوە ، با لە ماڵی خۆیان دانیشن کەس هیچیان لێ‌ناکا•• هەمووشت بڕایەوە •• ئیتر بەرەڤانیەتی ئاغامان گەڕایەوە هەموو شوێنێك •• با کەس خۆی پیاوخراپ نەکات ، هەمووشت تێك‌چوو ••• هەروەها وتی : دوێنێ ئاغای گوندی ئەولاو ئاغای خۆمان مەسلەتیان لەگەڵ یەك کردووە ، بڕیاریشیان داوە

لێرەوپاش ئەگەر مێشولەیەك تخوبی هەرلایەکیان ببەزێنێ ، ئەوان بە دووقۆڵی سەرەونگومی بکەن •

خەڵکەکە بەم دەنگوباسە هەموو دەمیان وەك تەڵەی تەقیوی لێهات ، لە جێی خۆیان سڕبوون ، بەڵام لەگەڵ ئـەوەشدا هیچێکیـان لەدڵـەوە باوەڕیان پێی نەدەکرد چونکە زۆرجار درۆی وایان لێ بیستبوو دوایەش زوو لێی سپی دەبۆوە •

« حاجی مەلا شێخ رەسوول » ، پیاوێکی ورگنی پەرچەم درێژ بوو ، یەك دووجار دەستی بە ردێنـە سـوورەکانی‌دا هێنـا ، ئینجـا رووی لـە « حەمەدەمین سەرکار » کردو گوتی :

— حەمەدەمین ، من حەفتەك لەوەپێش لەلای « مشیراغە » بووم ، چ ئەو باس‌و بازاڕەی لێ نەبوو •• ! ؟

ئەویش نەختێك لمووزی بەرزکردەوەو دەستەکیشی هاویشتە بەر پڕدێنی ئینجا وەڵامی دایەوەو وتی :

— جا یاشێخ ، ئەگەر ئێمەمانان سەرمان لە کاروباری ئەوانە دەرچـێ بۆچی جێمان ئێرە دەبێ ••؟!•

ئەویش سەری رەزامەندیی بۆ لەقاندو وتی :

— بەخوا باوکم راستە ، ئەوانە کەروێشك بە عارەبانە دەگرن • ئیتر دوای ئەمە هەر زەلامە دەستی لە کەلەکەی خۆی وەریناو دوو دووو سێ سێ بەرەورووی ماڵ بوونەوەو پەرتەیان لێکرد• «عەلی فیشەك» گرێ زەلامێکی تێکچەقی بوو ، کاتی خۆی ئەویـش هـەر سەری هەڵگرتبوو بەگەڵ نەیارەکانی ئاغا کەوتبـوو ، بـەڵام لـەوێ هەندە رەختەو فیشەکی هەڵدەگرت تا تووشی نەخۆشی باداری بوو، بۆیە بە هەزار ئەم‌لاو ئەولا هەتا ئاغە لێی‌بووردو هاتەوە لە ماڵی خۆی

دانیشت • لەگەڵ « حەمە سادق » پێکەوە بەڕێگادا دەڕۆیشتن ، هەرپەکو پەکویان بوو، دەم نادەم لە بن لێوان یەکتریان دەئاخاوت•• بەڵام جارجاریش ئاوڕیان لەملاو لەولای خۆیان دەدایەوە نەوەك « وەسمانە گنە »و « قالە گرگن »یان بگاتێو گوێیان لە قسەکانیان بێ • « عەلی فیشەك » بەتوندی دەستی بە سمێلیدا دەهێناو هەرجاری سێ چوار مووی بە ددانەکانی دەقرتاند ، دەمی خۆی لە بناگوێی « حەمە سادق » نزیك کردەوەو وتی :

— حەمە سادق ، دەبێ ئەوە راست بێ ••؟

ئەویش وەڵامی دایەوەو وتی :

— کوڕە دەبڕۆ ئەولای ماڵخراپ •• خۆ خانی چۆلۆکەی منداڵان نیە بە پێلەقەیەك بڕوخێ • ئەدی هەر دوێنێ نەبوو « عەریف جادر » لەناو کۆمەڵـە زەلامەك وتبـووی « ئاغا بـە چیمـان لێـدا بـەوەی لێیدەدەینەوە •• ؟ » •

— خۆ زۆر جار «حەمەدەمین سەرکار » ئەو قەوانەی بـۆ لێداینـەوە ، بەڵام نازانم بۆ ئەمجارە دڵم کەوتیتە خەتەرە ، باوەڕ بکە دڵم ئەوها لێدەدا لەترسان ترینگەترینگی لێوەدێ •

« حەمە سادق »یش نەختێك دەنگی بەرزکردەوەو وتی :

— هەی ماڵت کاول نەبی هەی ••! گەر تۆ بڕوا بەمقسەیە بکەی ئەدی خەڵکی تر دەبی چبکەن ••!•

— ئاخر دەزانی ئەوجارە قسەکانی « حەمەدەمین سەرکار » زۆر جودا بوون لەگەڵ ئەوانی پێشووی ••؟•

« حەمە سادق » بەتووڕەیی رووی تێکردو وتی :

— چ جیاوازەیەکیان هەبوو ؟•

— قسەکانی ئەوجارەی کورتو کرمانجی بوون ، نە گەفو گوڕی

تێدابوو ، نە لاواندنەوەو پاروو چەورکردنیشی تێدابوو ، زۆر بە بێمنەتی‌و بە لەخۆیی‌بوونەوە قسەی دەکرد •

— ئێستا ئەو حەوت‌و هەشتەی پێ‌ناوێ ، من بڵێم نێرەو تۆ بڵێی بدۆشە ، نەختێك ئارامت هەبێ ئیشەکە بە خۆی ئاشکرا دەبێ ، چونکە ئەم کارە کارێکی هەندە گچکە نیە کەسێ پێی نەزانێ •

— جا ئەگەر وابێ •• واتە ماڵمان کاول بوو و ئەە •• بەخوای ئاغە نایەلی ببینە ئاوخۆرەوەی گوندیش •

— چی ••؟ ئاوخورەوەی چی هەی خاك‌بەسەر •• گەر وابێ خاکمان لە توورەگە دەکاتن ، وەك مازی ناوتەبەق تەتڵەمان پێ‌دەکاو هەڵمان دەپەڕێنێ •

— ئەرێ وەڵڵا ••• وەکو قەساب بەناومان دەکەوێ‌و بە کلکی گۆپاڵ ئایەغ‌و نائایەغمان لێك هەرداوێری‌و ئەوسا دەماندانە دەست نەوعای وەك « حەمەدەمین سەرکاری‌و » « وەسمانە گنە »و « قالە گرگن »و « جەمیل قۆڵبڕ » ••

— ئۆە •• ئۆە •• ئۆە •• ئۆە •• ئەوجە خوا هاوارو خوا تۆبە •• بگرەو بکوژەو بدزە •••!•

## - ٣ -

ئەو دانی ئێوارەیە گەلێك کش‌ومات‌و خەمناك بوو ، خەڵك هەموو دەتوت بێ‌سەر دەڕۆن‌و خوڵ‌ودۆیان بەسەردا کراوە••! ماڵەکانی گەڕەکی « ئاشی » دەڕۆیشتن بۆ گەڕەکی « بن‌گرد »ی ، هی « بن‌گرد »یش دەچوونە گەڕەکی « باخچە » ، هی « باخچە »ش دەچوونە گەڕەکی « کەندێ » •• هەموو تێك‌قرقرا بوون ، سەریان لێ تێکچووبوو •••! ، میرزاو مامۆستاو مەلای گوندو قوتابی‌و هی‌تریش هەرچی خەت‌و قەڵەمی

هەبوایە چاوی بستەك عاردی نەدەدیت لە عەژمەتان ، جوتیارو شـــوان‌و بەرخەوان دەستیان داری نەدەگرت ، کابان‌و کەیبانوو هەموو شیویـــان بەمەنجەڵەوە کزکز لەسەر ئاگر دەسووتا هەستیان پێ نەدەکرد وەها وڕو گێژ بووبوون •• کەس نەیدەزانی چدەکاو چناکا •••!•

هەموویان بەتێکڕایی لـەدوو سۆراغی ئەم دەنـگو باسە دەگەڕان ••بەڵام هەموو مەولودیان لەخۆگرت‌و دەستیان پان‌دەکردەوە کەوا ڕاست دەرنەچێ • لە هەمووی سەیرتر ئەمـەبوو « وەسمـانە گنـە »و « قالـە کرگن » و « جەمیل قوڵبڕ » ••• هتد لە هەمـوویان تەنگاوتر بوون ، ئەوان لە هەموکەس زیاتر پـێ تێك‌چووبوون، بە دوو دەستان خۆڵیان بە سەرو کۆکری خۆیان دەکردو گوڕگوڕ فرمێسـکیان لە چاو دەهـاتە خوار •• بەڵام وەنەبێ لەبەر دڵسۆزی خەڵـکەکە بێ •• یان غیرەتیان بزووتبێ و دەماری پیاوەتیان لێ ڕوابێ •• نەخێر لەبەر ئەمە نەبوو •• هەڵکو ئەوانیش بـۆ نانی خـۆیان دەگریان ، چـونکە دەیانزانی ئیتـر ئەوانیش‌لێرە پاش ئاخوڕیان بڵند دەبێ چیتر سـەفتەی دینارو خواردنی چەورو باراش‌و داناشیان نادرێتێ •• ! •

بەرەبەری ڕۆژئاوا بوو قەوغایی کەوتە گوندو بووە چبوو•• چبوو•• کاتێك لە ئاوایی بووە دەنگ گوایە « مامەندی بلکە جەمرە » بەخشراوەو هاتوتەماڵەوە •• ئیدی خەڵکی گوندی هەمـوو ورووژایە ماڵی « پلـکە جەمرە » •• کە چـوون دیتیان وا « مامەنـد » لەسـەر پارچە لبادێـك هەڵکورماوە بستێك ڕدێنی هاتووە ، پێڵاوە لاستیقەکانی لەلای پێ‌ینگانێ هـەریەکی بۆلایـەك فڕێ‌داوە • بـەڵام لەدووررا هـەروات دەزانی هێشتان بەروپڕ دێن‌و خەریتەی جارانی لەخۆ ئاڵاندووە ، کەچی کە لێ‌ی نزیك‌دەبوویەوە دەتدیت ئەمە جێ‌شوونی خەریتەکانە کە هێشتان وێنەو

شوێنەواری لێماوە • هەموو ماندوونەبوونیان لێ کرد • « فەقی برایم » لێی چووە پێش هەندێ ئامۆژگاری بکا ، وتی : ـ مامەندە کوڕم ئەوە تو هاتیەوە ••!•• هاتیەوە •••!• خواکارت راست بێنێ ، بەڵام چ درۆو دەلەسانیش بلاومەکەوە بلێی چ نەماو ئاوی لەبن وەرکرا • بۆخۆت بەکڕی دانیشە ••!• « مامەند » کە گوێی لەم قسەیە بوو ئیدی چیتر خۆی پێ رانەگیراو دایە پڕمەی گریان •• بەڵام چ گریانێك لە ناخی دڵو دەروونو دەمارەکانیدا دەهاتە دەرەوە• ئەوان لەم تێکەو لێکەیە بوون کاتێك « سالار » هاتە ژوورەوە بە هانکەهانك رووی لە « فەقێ برایم » کردو وتی :

ـــ باوە •• باوە •• ئەوە « رۆستەم »ی براشم لەگەڵ « کاکەوڵا »و « لاوکۆ » وا گەیشتنەجێ •

« فەقێ برایم » هەڵسایەوە سەر پێیانو وتی :

ـــ کورە کوو ••؟•• دەبێ ئەوە کوڕی من نەبێ • « پاشان رەتەکی برد گەر قۆڵیان نەگرتبا لەسەر ڕا دەکەوتە ناو کەونە چاڵەکەی حەوشی ماڵی پلکە جەمرە » •

ئیتر لە ئاوایی بووە مقۆ مقۆ ، ئەو دەنگوباسی رەشەی کە بیستبوویان هەمووی راست دەرچوو ، ئینجا خەلك تێگەیشتن کەوا چی رووی‌داوە ••!• هەموو دەیانوت : « نەخێر ئەو زەبرە نە زەبری وەك چەند جارەیە •• ئەوە زەبرەکی وایە مرۆی پێ داغ دەبێ ••• » •

ئینجا ما خەڵك هەرکەس چاوەڕێی خزمو کەسی خۆی بکما •••!•• دەمنادەم دوودوو و سێسێ خۆیان دەکرد بە گونداو بێئەوەی قسە لەگەڵ کەس بکەن •• هەرکەس بەکڕی دەچۆوە ماڵی خۆی •• هەموو دەتوت کوندەی خوێنو ژەهرنو پڕتکردوون لە

بارووت‌و بەنزین ، ئەوها پڕ هەڵمابوون ، لە قەهران‌و لە خەفەتان لەگەڵ سێبەری خۆیان بەشەڕ دەهاتن ، بەڵام چشیان نەدەوت •

دایکی سەردار ، هەرگیز بیری لەوە نەدەکردەوە کەوا پیاوەکەی ویش بە دەست‌بەتاڵی دێتەوە ، دەیوت ئەوانەی هاتوونەتەوە هێشتان تام شیری خاویان لە زاری دێ بۆیە بەرگەی دەربەدەری‌و مشەختیان نەگرتووە •• بەڵام دڵیشی زۆر دەترسا •• لەگەڵ ئەوەش هەند بڕوای بە سەرداری خۆی هەبوو دەیوت هەرگیز ئەو قەڵایە رووخانی بۆ نیە •

شەو راشکا چرایەك لە گوندی نەدەبریسکایەوە ، ئاوایی کشومات بوو ، وا دەهاتە بەرچاو کەوا ئەم خەڵکە هەموو بەجارەکی مردوون یان نوستوون •• ، بەڵام کە لە هەر ماڵێك نزیك دەبوویەوە دەتدیت پێنج پێنج‌و شەش شەش ئەوە لەگەڵ یەك دانیشتوون‌و فسکەفسکیتیان‌و جگەرە دەکێشن ، هەر دەیانەوێ بزانن ئەم شتە چ‌بوو وەها کتوپڕ رووی‌دا • دایکی سەرداریش لەگەڵ مناڵەکانی‌دا هەر لە بەرسفکەکەدا دانیشتبوون‌و دڵیان شایەد بوو دەیانزانی ئەمشەو « مەجید میرزا » پەیدا دەبێ • ماوەیەکی پێ‌چوو هەروەك چەندجارە لەلای دیوارە نەویەکەی کۆزی بەرخان بووە خشپە خشپ • دایکی سەردار گەلەك دەنگی‌دا چوەڵام نەبوو ، کاتێك دەنگی خشپە خشپەکە زیاتر بوو بەڵام تەنها تەپەتەپی پێی یەك‌کەس دەهات ••• هەموویان هەر سەیری جێی تەپەتەپەکەیان دەکردو هەستی خۆیان راگرتبوو • کاتێك ئەوکەسەی چاوەڕێیان دەکرد لەناو تاریکیەکە هاتەدەرەوەو بەرەو روویان هات ، لەدووررا هەموو لەبەری هەڵسانەوە •• مناڵە وردەکانی هەموو شاد بوون بە بینینی باوکیان ، بەڵام زەلامی تایەن دووقەد ببۆوە ، ئەمجارە لوولەی تفەنگەکەی سەرەوژێر کردبۆوە • دایکی سەردار رووی‌تێ‌کردو وتی :

ـ مەجید کووە بەتەنهای ؟ •• ئەدی هەڤاڵەکانی چەند جارەت بۆچ لەگەڵت نین ••؟

« مەجید » خۆی سڵنەکردو باگۆی نەدایەوە •• بەڵام هەر لێیان نزیكدەبۆوە ، مناڵە وردەکانی خۆیان بە باوەشیدا دا ئەویش بێئەوەی سەری بەرزکاتەوە یەكیەك دەستی بەسەریدا دەهێنان ، ئینجا رووی لە مناڵەکان کردو وتی :

ـــ یارەبی خوا تۆڵەی ئێــوە بستێنی •• کە ئــەوەندە بە بێبـاوکی گەورەبوون • « دوایی ســەری بەرزکردەوەو چــەند هــەڤاڵێکی خــۆی کەوتنەوە بیر »و وتی :

ـ مناڵی واهەیە لە سکی دایکی بووە کە باوکی نەماوە ، ئێستا دەبێ ئەوان چیبکەنو بیشیان بە چی خۆش کەنەوە •؟ دایکی سەرداریش هەر لەپێوان راوەستابوو دەیویست جێی بۆ رایەخێ بەڵام گوێی بۆ قسەکانی شل کردبو ، کە ئەو قسەی لێ بیست ، ئەویش هەڵیدایێو وتی :

ـ خودا ئاغــە کۆرەو زەلیــل بکــا بــۆ خــاتری غەوسی بەغــدایە مەجیدیش رووی تێکردو وتی :

ـ ناوەڵڵا یارەبی خوا یەکەمجار خــۆمان بگرێ •••! • لەپاشــان دایکی سەردار بەپەلە چوو گێسکی لە ژوورەکە داو مافورە لاکێشەکەی هێنا لەسەر لبادەکەی راخست ، ئینجا وتی :

ـــ دە وەرە جارێ دانیشە با تۆزێك ماندووت بحەسێتەوە •• !
ئەویش بێئەوەی لەگەڵیان بئاخڤێ یاخود یاری لەگەڵ مناڵــە وردەکانی بکا ، تفەنگو خەریتەکانی لە خۆی کردەوەو لەتەك خۆی دانان ، هــەر دۆشدادەماو سەری خۆی بۆ عــاردی شۆڕدەکردەوە • خێزانەکەشی

هەر بەدەوریا دەهات‌و دەچوو • مەجمەی خـواردنی هێنا لەپێشـی دانا بەڵام ئەو دەستی بۆ درێژ نەکرد ، چـای بۆ هێنا چاشی نەخـواردەوە ، ئاوی بۆ هێنا ئەویشی نەخواردەوە • « سـەردار »و « دایکی سـەردار » هەر دەیاندواند ئەویـش هەر لەکـورتی دەیبڕیەوە • پاشـان « دایـکی سەردار » دەستی‌کرد بە هەڵبژاردنی ژوورەکەو دەیویست گوڕاحی‌یەکی بخاتە دڵی ، هیچ کەڵـکی نەبوو ، ئینجا ژنە وتی :

ـ چیتر هەندە هـووردو باریك لێمـەکە •• دەوجـە با بەس بێ خۆت کوشـت ، هەی ماڵداری کـەرێ ڕەنج بەخەساری • « مەجیـد » نەختێك بەتووڕەیی تێی‌ڕوانی پاشان سەری داخستەوە • «سەردار»یش کە تازە هەڵدەهات یەکەکی مووڕەشی چاوگەش بوو تازە خەتی سـمێڵی دادەنان ، لەخوار باوکی دانیشتبوو و هەر لێی وردەبۆوە •

ئەویش لەجێی خۆی پاڵی‌دایەوە ، تفەنگ‌و خەریتەکـەشی لـە باوەشی خۆی گرت • خێزانەکەی وا تێگەیشت کەوا دەنوێ خێرا چوو جاجمێکی یەکلای پێدادا ، بەڵام ئەو دەتوت کێچی کەوتۆتە کەوڵی ، هەر ئەملاو ئـەولای دەکـردو دەم‌نادەم دەکـۆخی‌و ئاخـێکی لـەگەڵ هەڵدەکێشا ، ناوەناوەش جگەرەیەکی پێدەکرد • خێزانەکەی گەلێـك هەوڵی‌دا نەختێك ئازاری کەم‌کاتەوە سوودی نەبوو ، ئینجا پێی‌وت :

— مەجید تۆش سایلی ئەو هەموو خەڵکە ، خۆ لەوان زیاتر نی •• ؟ •• لەگەڵ عامێ دەچمە شامێ •

« مەجید » یش بە دەنگـێکی نزم باگۆی دایەوەو وتی :

— بۆچی « ئەسمەر » ، ڕەنگە ئەو خەڵکە وەکو من نەبن‌و هەمـوو شایی‌و زەماوەندیان لەپێش دەرگا بگەڕێ‌و دڵیان گەلـەك خۆشـ بێ •• ؟ ••• ها ؟ •

ـــ تازه لەدوو چوان مەچوو ••• « دوایە دەستی درێژکردو وتی » :
دەبینە تفەنگەکەت بینە بەدارێی وەبکەم •• ئەو بەرچیغە چیـیە
هینایتەوە مالێ •• تازە بەکەلکی چ دێ •• ؟
ئەویش بە قورگـێکی پڕ لە گریان وتی :

ـــ هەر ئەوشۆی لەلام مایە •• توخوا با تێر لە باوەشی بگرم •• داخوا
سبەی « حەمەدەمین سەرکار » بە شانی چ تۆڕیەکی وەدەکا •• ! •

لەپاشان بەزۆری خێزانەکەی تفەنگ و خەریتەکانی هەڵگرت و بـە
سنگی وەکردن • ئەمشەوە هەرکەس بە دڵێـکی پڕ لە خەم و خـەفەتەوە
چووە سەر جێ و بالینگانی خۆی • کەڵەبابی ژن زیز بوونان بانگی دا •••
کەڵەبابی نیوەشەویش بانگیدا •• « سەردار » سەیری باوکی کرد هێشتان
هەر نەنووستبوو ، خون خون فرمیسکیش لە چاوەکانیرا دەڕژانەسـەر
بالیفەکەی • بەڵام کە کازیبەی بەیانیدا ئینجا نەختێك بۆرژا •

-٥-

هێشتان خۆر گزنگی نەدابوو ، قەدپاڵ و ملە زوورگەکان هەر بۆر
دەچوونەوە • کاتێك « ئەسمەر » بە دەنگـێکی بـەرز هـاواری کـرد :
« کوا سەردار ، کوڕە مەجید سەردار بزرە » • باوکی سەرداریش یەکەرم
خۆی لە عاردی بڵند کردو وتی :

ـــ کچێ ئافرەت چقەوماوە •

ئەویش بە چاوێکی پڕ لە فرمێسکەوە وتی :

ـــ سەردار لەجێی خۆی نەماوە ••• سەردار ••
باوکیشی وتی : ـ ئێ بەو ناوەختە کـێوە دەچی •• ؟

دوایە هەردوکیان بەناومالا دەگەڕان ، زەینیان دا تفەنگ‌و خەریتەکە لەشوێن خۆیان نەماون •• دایکی بەپەلەچوو سەیری کرد ئەو جووتە کلاشەی بۆ « مەجید » ی مێردی چنیبو ئەویش بە خۆو بە جووتە گوریەو بەلەك‌پێچەکانەوە لەوێ نەماون •• هەردوك واقیان‌وڕما •• لەدوایی‌دا « ئەسمەر » چووە دەرەوە ، لەقەد زوورگی دیتی ئەوا « سەردار » بەگردی‌دا هەڵدەگەڕێ ، بەلام چ « سەردار » ەك ، دەڵێی خەنجەری دەبانە ، هەتا چۆکی خۆی هاویشتۆتە ناوگۆریە ، ڕەخت‌و فیشەکەکانی باوکی هەموو لەخۆ ئالاندوەو تفەنگەکەشی لەسەر شانی داناوە ، ئەوا وەك گورگی فەرخەخورای لەخۆی هەڵدەداو دەڕوا •• ! • دایکی بەسەربانی کەوت‌و گەلەك بانگی کرد : « کوڕە هۆ •• هۆ •• سەردارە کوڕم هۆی•• بگەڕێوە •• چیتر جەرگم بەشیش وەمەکەن •• » دادی‌نەدا •• لەبەرچاو ون‌بوو • لەدواییدا لە سەربانی هاتەخوارەوە ، ویستی بە پێیان بکەوێتە دووی ، بەلام « مەجید » لێ‌نەگەڕا ••• ! و بەزۆر گەڕاندیەوە ژووریٚ •

# فەرهەنگۆك

ئاو خۆرەوە : ئەو پالەیە کە لە دێ‌دا دادەنیشی هیچ زەوی‌و زارو مەڕومالاتی نیە •

باگۆ : وەلام •

بەرسفك : هەیوان •

بەرچیغ : ئەو دارەیە دەدرێتە بەرچیغی رەشماڵ •

بەرەڤانیەتی : حوکم •

پەکو : وشەیەکە لەکاتی خەم‌و خەفەت دەردەبڕدرێ لەجیاتی « بەداخەوە » •

خــەریتــە : رەخت •
خۆی سرنەکرد : خۆی تێك نەدا ، بەسەر خۆی نەهێنا •
داناش : ئەو دانەوێڵەیە کە بۆ ساوارو برووش ••• هتد دەبرێت بـۆ ئاشــ •
ســەردار : سەرەڕای ئەوەی ناوی مرۆیــە ، بە وانای « مێــرد » یـا « خاوەن ماڵ » یش دێ •
ســـایل : وەك •
فسکەفسك : قسەکردن بە دەنگــێکی نزم •
قەرەبینا : جۆرە دەمانچەیەکی کۆنە •
قەوغایی : قەڵەبالغی •
قیرپاچ : شیشەیەکی بۆ لەدەستگرتن بەکاردێو تێل یان وایەری لێ دەئاڵێنرێو وەك حەیزەران شلکە •
گوڕاحی : خۆشــی ، شادی •
لێك هەراوێردن : لێك جیاکردنەوە •
مەسڵەتی کردن : پێك هاتنەوە •
مەجمە : سینی ، خوان •
مێخزنجیر : ســنگ •
هامار : پەلامار •

# بۆ دووسەد ساڵەی شاری نازداری سلیمانی

ساڵی ١٩٨٤ تەمەنی ئەو شارە نازدارەی کوردستان دەبێت ، بە دووسەد ساڵ • زۆر لەجێدایە ، کە هەموو یا زوربەی بەرهەممان لەوساڵەدا بۆ ئـەو یادی دووسـەد سـاڵەیە تەرخان بکەین •

دوسەد ساڵی بەنرخی مێژووە،دووسەد ساڵی بەخشمە ، دووسەد سـاڵی خـەبات‌و هەڵمەت‌و قوربانی‌یە •

شاری تێکۆشان ، شاری شیعرو پەخشان، شاری پیاو گەورەو مەزنان ، شـاری بابان‌و شێخی قارەمان ، شاری ئاوازو قسەخۆشان ، شاری ڕقدەربڕین‌و پڕبەدل جنێودان ، شاری مـەردان •

ئەگەر تەمەن ماو نووسەری کورد•• ما ، وا لە ژمارەی داهاتووەوە بەرنامەیـەکی کـاری سـاڵانـە بۆ بایـەخی بـەرزی ئـەو شارەو ئەو یادگارە بڵاودەکەینەوەو خۆشمان دەست دەکەین بە بەشداری‌و بڵاوکردنەوە • ئەگەر ژمارەی گۆڤاریشمان لێرەدا وەسـتا ، ئەوا ئەم چەند ووشەیەو ئەم چەند یادگـارە

بڵاوکراوەیە ، سەرەتاو وەسیەتنامەی « نووسەری کورد » ی ئاوابووە ، بۆ گۆڤارو ڕۆژنامە کوردی‌یەکان کە لەجێی ئێمە ئەو دووسەد مۆمە لەوساڵەدا هەڵکەن ، هەروەك وەسیەتنامەی یەکێتی‌ی نووسەرانی کوردە بۆ هەموو شاعیرو نووسەران کە ناوی خۆیان لەتەنیشت ئەو مۆمە گڕو ڕووناکی‌دارانەوە تۆمارکەن‌و دەرفەت بۆ بەرهەمی خۆیان بدۆزنەوە تا بڵاوبکرێتەوەو بگاتەوە خەڵکی بەوەفای شاری سلیمانی •

ئەمە ئەرکی ئێمەیە •• هەرچی هاونیشتمانانی‌ترە ، ئەوە ئەوانیش هەریەکە ئەرکێکیان بەرامبەر ئەو شارەو ئەو یادگارە هەیە ، هیوامان وایە بەجێی‌بێنن •

## لە زمان هەڵۆیەکی بریندارەوە

مەحوی ئەڵێت :

**( بێستوونی عەشقی شیرینێك ئەوا هاتۆتە پێش )**
**( گەر لە حەق بێم ، یا نەیەم ، تەقلیدی فەرهادێ ئەکەم )**

**« کاکەی فەللاح »**

حەمەکانم هەڵگرتووە
بە هەورازی ژانەکانما سەرئەکەوم
بە شەبەقی زامەکانما مل‌ئەنێم‌و
ئەنێمەوە

لەبەر کڵپەی خوێنە گەشە ڕژاوەکەم
سرووودی داستانەکەی خۆم ئەڵێم و
ئەڵێمەوە :

وا بۆ سەدوپەنجا ساڵــە
ئەرخەوانو داری ژاڵــە
یان گوڵاڵــە
لەم شاری ڕەشەبایەدا
تێراوی کانیاوێــکن
لە جێگەی ئاو ، خوێنی ئاڵــە

سلێمانــی !
قۆچەکەی ڕۆژی قوربانــی
شاری وەیشوومەو ڕەشەبا
لەوڕۆژەوە
هەوری چاوی هەردوو چامەی
نالی و سالــم
لەم وڵاتی شارەزوورە
بارانێکی ڕەهێڵەیەو
لە خۆشکردنەوەوە دوورە
لەوساتەوە
هەڵۆیەکم بریندارم
لەم چیاوە بۆ ئەو چیا
خۆم ئەگێڕم

لەدەوری سەری ئەم شارە
بێقەرارم

نەخشەکەی من
بە دەستی ڕاوکەرانەوە
ئەڵێم بۆ دێوجامە لـوا
لە گیرفانی سیاسەتی ئەمو ئەوا
حەشار درا
سنوورەکەم لە تاریکیی نیوەشەوا
پێشێل کرا
مرۆڤو خاکو ئاوەکەم
لە قەسابخانەی پیلانی دەوڵەتانا
لە سیقەرا ، لە لۆزانا
چەشنی گۆشتی قوربانی
بەئاشکرا
لەتلەت کـرا
لەگەڵ هەموو ئەمانەشا
ئەگەرچی زەدەو پێکراوم
من ئەو هەڵۆیەم هەر ماوم
بۆ هەناسەی خاکو ئاوم
بۆ نەخشەو هێلانەو ناوم

گەر باوەڕ بە بوونم ناکەی
بڕۆ لە ڕەشەبا پرسە
ئەو ئەزانێ

منی هەڵۆ ، سەرسەختێکم
درەختێکم
چی گەڵای لێ هەڵوەرانم
چەن لق وپەلی شکانم
هەرچی ناشێ و ناکرێیە
شیاو کردی
ئنجاکەمێ لەلای وایە
مردن ملم پێ کەچ ناکاو
رەگەکانم
بە دەروونی خاك و ئاوێکا
ڕۆچوونو
بوونە ناخی ئەو رۆژگارو مێژووەی
لەبن نایە
باوەڕبە ئازارم ناکەی
بڕۆ لە ئەستێرە پرسە
ئەو ئەزانێ
ئاخۆ چاوی شەوگاری
کارەساتی من
تاقە وەنەوزێکی دیوە

کێ نایزانێ ، کێ نەی دیوە
نەی بیستووە
لە رۆژگارێکی ڕەشا
لە ئەشکەوتێکی تۆڵەدا

سەدان چاوو دڵی منیان
به ئاشکرا
وەکوو پڵو پووشی پاییز
لەبەر زەقەی چاوی مافا
کە ئاگردا
ئێستەش لە چاوی مێژووا
دووکەڵی ئەو بۆچڕووکە
لەودەمەوە
هەر ماوە خۆی ئــەخواتەوە
نەء منو تۆ ئەخواتەوە

کێ نایزانێ ، کێ نەیدیوە
نەیبیستووە
لە پارچە جەرگێکی ترا
ئەستێرە گەشەیەك هەڵهات
بۆ نەورۆزو بۆ بەهاری
بارانێکی رەحمەت باری
بەدەم وەشتی بەیانەوە
هەزاران گوڵ گەشانەوە
کوێرەکانی سەدان خولیاو
هیوای بەرز ژیانەوە
تا پەڵەهەورێکی چڵکن
وەك ژەهری مارێــکی ڕقن
لە ئاسمانی ڕۆژئاواوە
پەڵەپەل گەییە ئەم ناوە

کردی بە گرمەو لافاوێ
بە بروسکەو بە گێژاوێ
هەرچی هەبوو
ئەستێرە ، گوڵ
کانی ، نەورۆز
شنەی شەماڵ
خولیا ، خەیاڵ
هەمووی کردن بە کۆی زوخاڵ
شیرینی لێ کردم بە تاڵ

تا لە ئاسۆی مەهاباتا
وەختەبوو برینەکانم
سارێژ ببن بە کۆمارێ
جا بیمەوە بەو هەڵۆیەی
پڕ بە گەروی ئەم دنیایە
هاوار بکەم
بچریکێنم
بزریکێنم :
منیش وەکوو ئێوە هەمو
خۆشەویستی زۆرم پێیە
هیوای جۆربەجۆرم پێیە
دڵێکی وەك خۆرم پێیە
کەچی دڵۆپێ دەنگ نییە
لە بارانی دەنگەکانا
بڵێ وایە

لێرەش بەرازی بەلەسە
ڕەوە گورگی پەروەردەی قین
دڕندە مرۆڤخۆرەکان
شفرەو کەڵبەی خڵتانی خوێن
کۆماری کرد بێسەرو شوین

لەوساشەوە منی هەڵۆ
منی گۆشکراوی چیای
گەردن بەرزو لوتکەدارم
بە ئاسمانی فڕینەوە
لێرەو لەوێ

هەر کاروانی کۆچ ئەبینم
قۆچو پرسەی قۆچ ئەبینم
کانیو کارێزو سەرچاوە
ئەبینم بێنازی ئاوە
ئەستێرەی دێ ئەکوژێتەوە
میوەی ساوای سەرسنگی دار
تینووەو بەرئەبێتەوە
بـــاخ
بەگڕی دۆزەخی تاڵ
سەرانسەر بۆتە ئاخوداخ
نە کەس ئەڵێ ناوت هەیە
نە خاکو نە ئاوت هەیە
نە مێژووەو نە نیشتمان

نە بەردەکێلی ناونیشان
بۆ ڕەتان و ستەم نەبێ
کەس بیری ناکەوینەوە
لەسەر دڵی بێدڵەکان
خەمێکین ناڕەوینەوە

منی هەڵــۆ
لە پارچەکانی جگەرما
ئەم ژانانە دێن و ئەچن
هەر پێچ ئەخۆن و لوول ئەبن
چاوێکن لە گل ناکەون
ئازارێکن هیچ ناخەون
بەڵام ئێمەی توخم هەڵۆ
ئێمەی چیا سەربەرزەکان
گۆشی ئازارو ژانەکان
هیچ بە کڕنووشی نامرین
بە مەرگی خوایی نامرین

منی هەڵۆ
لەم ئاسمانە بەرزەمەوە
بۆ خۆم و بۆ هێلانەکەم
بۆ کوردو کوردستانەکەم
چاوم بڕیوەتە ئاســۆ
چاوم بڕیوەتە ئاســۆ

# شەوانی سلێمانی

محمد امین پێنجوێنی

کــە دوور بم لێت ئەزانم نرخی زێڕت
کولوورو گەنجی دنیایە
نزیك بم لێتو لات بم ،خۆشەویستیت
بەهرەیەکە قەت لــە بەها نایــە •••
وتم : بــا دڵ بترسێنم بە دووریت
کەچی وا هەر (ڕوو) لە تۆیەو لەل (١) من نایە
لەبەینی (تۆ) و ( دڵ ) ا سەرگەردانە هۆشم
بەڵام وا مەیلەکەی هەرگیز ( بەرەودوا )یە !
( گوزار ) ی (٢) چی ؟ چاوەکەم ، من شەڕەفرۆشم •••
کە سوژدەی ( بەندە ) هەر بۆگەورەییی ( خوا ) یە •••

بودابست
٦ ـ ٩ ١٩٨٢

---

(١) لەل : لەگەڵ •
(٢) گوزار : گەشت •

# چاوی بەردە قارەمان ...

محمد نوری توفیق

زۆر جار کــە باوکم باس‌و بەسەرهاتێکی بۆ ئەگێڕاینەوە ناوی‌لێ ئەنا هەقایەت ، وابزانم ئەمەش هەر لەبەرئەوە بوو کەئیمەی منـــداڵ حــەزمان بەوە ئــەکرد کە هەمــوو ڕووداوو کارەســاتێك لـە قاڵبـی چیرۆکدا بێ خۆشترو ڕەوانترە ، یان هــەر خۆی ـ وەك ئەیـــدا بەگوێمانا ـ حەزی‌ئەکرد پەندو عیبرەت لـــەو چیرۆکانە وەرگرین کە ئەو ناوی هەقایەتی بەسەردا ئەبڕین ؟ ..

لــەو هەقایەتانەی کــە تائیستا ڕۆژگار لە دووتوێی شــانەکانی مێشکما نەیسڕیونەتەوە ئەم چیرۆکەیە کەئــەو بە هــەقایەتی کاکیلێی ناوئەبردو بەم مانایەی لای خوارەوە بوو ..

تازە سوپای داگیرکەر ( مەبەستی لە ئینگلیزەکان بوو ) بەرەنگاری داواکانی کورد ببۆوەو هیرشێکی بەربلاوی هێنابووە سەر ولاتەکەمان ، سوپاو ژەندرمەکانیان ، تۆپ‌و فرۆکەکانی لە هەموولایەکەوە کەوتبووە شەڕ پێ‌فرۆشتن‌و لێـــدان‌و دابێژانی شارو دیهاتەکانمـــان .. شێخ ( مەبەستی شێخ مەحمود بوو ) لەگەڵ جەنگاوەرو دەستەو دایەرەکــەیا لەبەر پاراستنی گیانی خەڵکی بێ‌دەسەلاتی ناوشارەکان ، پەنایان بردبووە بەر چیاو ناوچە سەختەکان، لەوێوە خۆیان کۆکردبووەوە بۆ بەربەکانێی

دوژمن‌و شەڕ لەگەڵ کردنی، پۆل پۆل خەڵکەکەی سەر بە شێخ بەسەر ناوچە هەمەجۆرەکاندا دابەش‌بوون بۆ پاراستنی نیشتمان ، بەڵینیان نوێ ئەکردەوە کە لەپێناوی رزگاری‌و سەربەخوییدا بجەنگن‌و بەفرت‌و فێڵ‌و سویند و بەڵینی ئینگلیز فریو نەخۆن ••• لە زۆر لاوە ، سەرەڕای کەمی چەك‌و تفاقی شەڕو توانای بەردەوامی بەرەنگاری لەگەڵ ئەو دوژمنە بەدەسەڵاتەدا دەستی گەورەو گرانیان لە داگیرکەر ئەوەشاندو لەزۆرلاوە شکاندیانن‌و سەریان پێ دانەواندن ، شەڕ تا ئەهات پەل‌و پۆی ئەهاویشت‌و پان‌وبەرین ئەبووەوە ، دوژمن هەموو کوردێکی بە جەنگاوەر و سەر بە شێخ ئەزانی‌و لەگەڵ ئەواندا ریزی ئەکردن •• لەناو کوڕانی شار و لادێدا کەسانی ئەوتۆ سەودای ئازادی لەکەللەی ئەدان ، ئازایی‌و چالاکی‌و نەبەردی لە ناوچەوانیان ئەباری •• تا ئەهات خەڵکەکە پڕ چەك‌و باوەڕ ئەبوون بۆ دەربەڕاندنی داگیرکەر ، هەر رۆژە لەلایەکەوە ، گەرمیان‌و کویستانیان لە دوژمن کردبووە دۆزەخ ، هەردەمە لە شوێنێکەوە ، هەر کاتەی لە ناوچەیەکەوە بەدەمیا ئەتەقینەوەو داخیان ئەنا بە دڵی‌یەوە •• لەو تاقم‌و کۆمەڵانە لەم دەشتو بنارانەی خۆماندا تەنیا پێنج کەس کارێکی ئەوتۆیان بە داگیرکەران کرد کە هەتاهەتایە ئەبێ مێژوو بەرێزو نەوازشەوە پیایانا هەڵبداو باسیان بکات •• ئەو پێنجە بە چەکو کەرسەیەکی کەمەوە توانی‌یان سەر بە ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە سەربازو تۆپ‌و فڕۆکەی دوژمن شۆڕبکەن لەشەڕێکدا مەگەر هەر لەدەست ئەوان هاتبێ • یەکەمیان :

ـ کوڕینە بەقوربانتان‌بم ، هەر ڕۆژێکە و ئەمڕۆ ، بتانبینم چی‌یان بەسەر دێنن •

دووەم :

ـ بەسەری تۆ کارێکیان پێ ئەکەین هەتاهەتایە لەبیریان نەچێتەوە •

سێیەمیان:

ـ چەپکە گوڵی دەستمان بۆ شێخ و هاوڕێکانیو هەمووجەنگاوەرانی چەپکێکی ئەوتۆ بێ لەوناوەدا دەنگ بداتەوە •

چوارەمیان :

ـ میللەت چاوی لێمان ئەبێ کەچۆن کەللەسەری دوژمن شەق ئەکەینو جەرگو دڵی داگیرکەران ئاوئەدەین •

پێنجەمیان کە کوڕێکی کورتە باڵای تیکسمراو بوو ، هەتا حەزبکەیت چستو چالاكو لێهاتوو بوو ، ناوی ( کاکل ) بوو خەڵکی ئەو ناوچەیە لەخۆشەویستیدا پێیانئەوت (کاکیلێ) بەجۆرێك خۆی پڕچەك کردبوو پیاو لێی تێر نەئەبو ، سەرسنگیو راستو چەپی باڵەکانی لە فیشەکدا زەرد ئەچووەوە ، خەنجەرێکی دەبانی کردبوو بەقەد پشتێنەکەیدا ، کە تفەنگەکەی ئەکردە شانی پیاو سامی لێ ئەنیشت • کاکێلێ وەڵامی برادەرەکانی دایەوە :

ـ براینە لە منتان نەکەوێ ، هەلەو بۆمان هەڵکەوتووە ، هەلیوا هەموو رۆژێ هەڵناکەوێ ، ئا بزانم چۆن چۆکیان پێ دائەدەنو ئەیانکەن بە پەندو عیبرەتی زەمانە •

شەڕ دەمەدەمی کازیوەی بەیان دەستیپێکرد ، هەتا ئەهات گەرم ئەبوو ، تۆپو فڕۆکەو مەترەلوزی ئینگلیز ئاگرو ئاسنی بەسەر ئەو کوڕە ئازایانەدا ئەباراندکە لایدوژمن ژمارەیان ئەوەنە زۆر بوو سەری لێ دەرنەئەکرا، دارو بەردی ئەو شاخە سوور هەڵگەڕابوو، پەیتا

پەیتا لە سەربازگەکانیەوە بەیارمەتی‌یانەوە ئەهاتن بۆئەوەی دەنگی تەقەیان کپ بکەن ، تاقمەکەی کاکیلێ لە دەمەو خۆرئاوادا تەنگیان بە دژمن هەڵچنی ، ئەمەندە لاشەیان لێ ڕیز کردبوون و چەکو جبەخانەیان لێ پەك خستبوون لە ژمارە نەئەهات ••• دەمەدەمی ئیوارێ ، کاتی خۆر ماڵئاوایی لە بناری گوپاڵە ئەکردو بەناچاری ئەیویست چاوەکانی لەو جەنگاوەرانە بکشێنێتەوە ، ئا لەوکاتەدا هێزەکەی دوژمن بە سەرشۆڕی‌و تیکشکاوی کەوتە پاشەکشێ‌و گەڕانەوە ، بە پەلەپرووزێ لە هۆڵی ئەوەدا بوو پێش ئەوەی تاریکایی شەو باڵی ڕەشی بەو ناوەدا بکێشێ بگاتە سەربازگەکەی خۆی •• لەکاتێکدا کە فەرماندەی هێزەکە خەریکی گەڕانەوەی سوپا شکاوەکەی بوو خێرا خێرا لە دوربینەکەی ئەنەوی و بە سەرسامی‌یەوە سەرنجی لەو سێ کەسە ئەدا کە بێ‌پەروا نیشتبوونە سەر سوپاکەیەوەو چنگ لەسەرشان بەرەو سەربازگەکەی راویان ئەنان‌و لێ‌یان نەئەبوونەوە •• زوو زوو دوربینەکەی لائەداو دەستی بە چاوەکانیا ئەهێنا نەك بەدرۆیان بەرن‌و ئەوانەی دوای سوپاکەی کەوتوون تەنیا ئەو سیانە نەبن لە دوربینەکەیدا بە ناخی چاو و دڵ و مێشکیا ئەچەقین ، هەرچەندی ئەکرد لەو ژمارەیە تێ نەئەپەڕین •• ئەفسەری فەرماندە لە ترسی تێکشاندنی یەکجارەکی فەرمانی دایە هێزی پاراستنی دوای سوپا هێرش‌بەرەکەی

**ئاگرەکەیان توندترکەن تا باڵی ئەو هەڵۆیانە بشکێنن کە دوویان**

کەوتوون •• تاریکایی شەو تا ئەهات توندتر چنگی لە بینی ئەوناوە توند ئەکرد • لە دواتەقەی هێزەکانی دوژمندا پریشکی گوللەیەك چاوی راستی کاکیلێی پێکاو رەشینەو سپێنەی بەیەکا تۆپەڵ کرد، کاکیلێ بەدەما ئەکەوێ و دوو برادەرەکەی لێ‌ی‌ئەنەون بەرەو دواوەی ئەبەن بۆ لای دوو لاشەی برادەرەکانیان •• بەمە سوپای داگیرکەر لە چنگی‌یان

ڕزگاری ئەبێ، بەڵام دەنگوباسی ئەم پاڵەوانیتی‌یەی کاکیلی بەهەموولایەکدا پەل ئەهاوێژێ‌و ئەشکەوتەکەی جاسەنە دەنگ ئەداتەوە ، ئەمەش گەورەترین دیاری‌یە لەو ڕۆژەدا پیشکەش بە شێخ‌و جەنگاوەرەکانی ئەکرێ .. پاش چەندروژێك لەسەر داوای شێخ کاکیلێ و دوو برادەرەکەی بەرەو جاسەنە ئەکەونەڕێ .. شێخ بەپیریانەوە ئەچێ و لەپێشوازی‌یانا دەم‌ئەخاتە ناودەمیان و تێر ماچیان ئەکات‌و بۆ خەڵات‌و ڕێز لێ‌گرتنیان ڕووئەکاتە کاکیلێ :

ـ تا پێمان بکرێ‌و بە هەر نرخێك بێ نایەڵین ئەو چاوە جوانەت ئاوها بمێنێتەوە ، لە هەر وڵاتێك بێ هەوڵی ئەوە ئەدەین پزیشکانی شارەزاو لێ‌هاتوو ئەگەر چاوێکی ساغیشت بۆ دروست‌نەکەن بەلای کەمەوە کارێکی‌وا بکەن کە پێتەوە دیارنەبێ ..

کاکیلی هەروەك وەڵامی بۆ ئەم ڕێزلێنانەی شێخ ئامادەکردبێ :

ـ یاشێخ ، وڵاتێك بەو هەموو خۆشەویستی‌یەوە چاوێکی کاکلی پێ نەبڕی‌و یان کاکل بەوە ناشرین بێ کە چاوێکی بە دەستی دوژمن کوێربووبێ ، ئەبێ چۆن ئەو خۆشەویستی‌یە لەڕووی بێ لەناو هەموو خۆشەویستیەکانی ئەم دنیایەدا سەرهەڵبڕێ ؟؟ .

هەر لەوێدا پەلاماری خەنجەرەکەی قەدی ئەداو لەچاوە دەرپۆقیوەکەی ئەنەوێ لەرەگوو ریشەدا ئەیبڕی و تا دەستی ئەتوانی تووڕی هەڵئەدا ...

## شێخی گەورە

ع. ح. ب.

سەری هێناو برد
ئەکولا بۆ کورد
ئەیویست ئەگەر دایناوە سەر
شتێ بێنێتە بەر
ئەیزانی درەنگ وەختە
ڕێگاش هێجگار سەختە
تەرزە
کەژەکانی هێناوەتە لەرزە
دوژمن وەك سەگی هار
ئەدا پەلامار
بەڵام ئەم
گوێ ناداتە ستەم
لە ترسەوە دوور بوو
لەسەر ڕای خۆی سوور بوو

ئەیوت ئەگـــەر دێ بەدێ
ئەگەر بێتو شتێ نەکەین بە شتێ
ئیتر تا مـــاوین
بێ شێل و بەش خوراوین
ئەیزانی درەنگ وەختـــە
ڕێگاش هەورازو سەختە
بەڵام ئـــەم لـــەپەناوە
وردو لەســـەرخۆ
بەوپەڕی بڕواوە
ئەیڕوانی یە ئاسـۆ
بـــە بێ دەنگی
پێی خستە ئاوزەنـــگی
لـــەبەرەبەیانێکی درەنگدا
هاوەڵەکانی دەنگ دا
ســـوور ئەیزانی
ستەمـــــە مـــانی
هەزاران توولەمار لـــەناودا
ئەسپی تاودا
لـــە گشت لاوە وەزەنی
تەنگی بێ هەڵچنی
باشترین هاوڕێی
جوێ بووەوە لێی
ئەسپ کەفی ئەچەند
شێخ ئەڕۆیی بەرەو دەربەند

ئەوان ئەوەندەی گەڵای دار
زۆرو بێشومار
ئـەم
خۆی‌و چەند هاوڕێیەکی کەم
ئەسپ گلا
شـێخ کەوت
لەژێر بەردێکی زلا
بۆ ماوەیەك سرەوت
ئەوا زامارە
دوژمن نایە لە ژمارە
سەری نەنەوان
بە زمانێکی ڕەوان
بە دەنگـێکی زوڵاڵ
قارەمانی قاڵ
لە گەورەکەیان کردی ڕوو
ناوچاوی پڕکرد لە تفوو
وتی : زامەکەم هەوێنە
بۆ پڕکردنەوەی ئەم کەلێنە ..

# خۆشـترین ڕۆژی ژیانم

هۆگر گـۆران

له ئینگلیزی‌یەوه وەری گێڕاوه

لەپیش هەموو شتێك‌دا باسی ئەوەتان بۆ ئەکەم چۆن دایك‌و باوکم بەینیان تیك‌چوو دوای ئەوەی له ئاهەنگی هاوڕێ‌یەك له دەرەنگە شەوێکا هاتنەوه •• بـۆ سـبەینێ قسـەیان نەئـەکرد پێکـەوەوه هەریـەکەیان بەشێوەیەکی جیاجیا قسەی لەگەڵ من ئەکرد •• بەبێ‌ئەوەی بهێڵن مـن هەست‌بکەم به ڕوودانی هیچ شتیك لەبەینیانا•• بەڵام من هەستم ئەکرد که شتێك هەیە• من ئەمەم زۆر پێ ناخۆش بوو لەبەر دڵ‌تەنگی خۆم نەم‌ئەویست بچم بۆ ئاهەنگی قوتابیان • باوکم‌و دایکم هەروەکو لەگەڵ یەك‌دا تێك چووبوون ، لەگەڵ منا بەشێوەیەکی جیاواز رەفتاریان ئەکرد بۆئەوەی ئەم مەسەلەیە کارنەکاتە سەر من. که من نەچوم بۆ ئاهەنگەکە باوکم ویستی لەگەڵ خۆی بمبا بۆ باغچەی حەیوانات• دایکیشم ئەیویست بمبا بۆ(سیرك)، بەڵام داواکانیان هیچ شتێکی له دڵی من‌دا نەگۆڕی‌و هەتا ئەهات زیاتر دڵتەنگ ئەبوم ، بەتایبەتی له کـاتی نان‌خواردنی بـەیانی‌دا بـاوکم دای بەگوێما که هیوای وایە بیرم نەچووبێ چۆن پیروزبایی له دایکـم بکەم بەبۆنەی جـەژنەوه •• دایـکم بێ‌ئەوەی سەیری بـاوکم بکـات وتی « ڕۆژنامەکەی بۆ بێنه » ئەوەش نیشـانەیەکی باش نەبوو که نەی‌وت «بۆ بـاوکت » ••• ئاشکرابـو کـه دایـکم‌و باوکـم نایانـەوێ مـن بـه

ناکوکیەکەیان بزانم • لە دڵی خۆما ئەموت لەوانەیە ئەگەر لەماڵەوە بن‌و نەچن بۆ دەرەوە ئەو ئێوارەیە تا بەیانی هەمووشتێك بچێتـەوە دۆخـی جارانی لەگەڵ ئەوەدا ئەنجامی نەبوو و هەر قسـەیان لەگەڵ یـەکتری نەکرد•• بۆ سبەینێ‌و ڕۆژی دوایی کەوتمە بشکنین‌و چاودێری کردن• لەکاتێکا لە فرمان هاتنەوە نەخشەیەکم دانا هەندێك پرسیارم ئامادەکرد کە کە لێ‌یانی بکەم بەڵکو بیانهێنمە قسەکردن‌و دوان لەگەڵ یـەك ، بـەڵام هیچ سوودی نەبوو • من هەر دامابووم • پێنج ڕۆژ بەوجۆرە تێ‌پەڕی ، بەڵام هەر قسەیان لەگەڵ یەك نەکرد • وەها دیاربو ئەم قسەنەکردنەیان کردبێت بە عادەت •• ئەوحاڵەش وای لە من کـرد بیربکەمەوە شـتێك بکەم بەڵام چی ؟ بیرم‌کردەوە کە هەندێك‌جار خۆشی‌یـەکی زۆر یـان ناخۆشی‌و ناهەمواری خەڵك لەیەك نزیك‌ئەکاتەوە •• دروسـت‌کردنی خۆشی کارێکی گران بوو ، بەڵام ناخۆشی‌و ناهەمواری کارێکی ئاسـانە • من کارە گرانەکەم هەڵبژارد ـ بەبیرما هات کە تەقەلا بدەم نمرەیـەکی باش وەربگرم لە دەرسی ماتماتیك‌دا ••ئەوەش خۆشی‌یەك ئەخاتە ناومان، بەڵام لەبەرئەوەی قوتابخانەم نەبوو بەهۆی پشووی نیوەی ساڵەوە هیچم بۆ نەکرا •

بڕیارمدا دەست‌بکەم بە پاك‌کردنەوەی ماڵ •• چەند سەعاتێك خۆم لەناوماڵاخەریك کرد بە پاك‌کردنەوەو ڕێك‌خستنی ماڵەوە ، بـەڵام کـە ئێوارە دایکم‌و باوکم هاتنەوە سەرنجیان نەدا لەو کارەی من ، چونکـە دایکم لەپێش جەژنا ماڵەوەی پاك‌کردبوەوە• بەپێچەوانەوە سەرنجیان‌دا لە خۆم کە سەرو گوێلاکم‌و جلەکانم تۆزاوی‌و پیـس بوون • کە باوکـم لێی‌پرسیم وتی کارێکی باشە کە یارمەتی دایکت داوە بەبێ‌ئەوەی سەیری دایکم بکات دایکیشم ماچی کردم‌و دەستی کرد بە پاك‌کردنـەوەم •• بۆ ڕۆژی دوایی سەعات حەوت هەڵسام‌و سویچی ڕادیوکەم کردەوە •• بە

بێ‌سه‌یر کردن دایکم وتی ( ئه‌وه بۆ باوکت باشه یارمه‌تیم بدات‌و چاو له تۆ بکات ) ..

ئیتر بڕیارم‌دا که کارێکی‌وا بکه‌م دڵته‌نگیان بکات‌و خه‌میان بده‌مێ نه‌ك خۆشی ، به‌ڵام چی خه‌مێك‌و چی ناخۆشیه‌ك ؟

باشترین شت ئه‌وه‌بو خۆم به‌درۆ نه‌خۆش‌بخه‌م‌و له‌ناو جێگادابکه‌وم، به‌ڵام که بیرم له دکتۆرو ده‌رمان کرده‌وه وازم له‌و کاره هینا . له‌دواییدا بیرم‌کرده‌وه که باشترین شت ئه‌وه‌یه بچم بۆلای ( گڵکۆ ) ی هاوڕێم .. ئه‌وناوه‌ش نازناوی ئه‌و هاوڕێیه‌م بوو چونکه عاده‌تی وابو که هه‌ر قسه‌یه‌کی بکردایه بۆ که‌سێك داوای لێ ئه‌کرد که له‌لای که‌س باسی ئه‌و قسه‌یه نه‌کات‌و بێ‌ده‌نگ بێت وه‌کوو گڵکۆ ( گۆڕ ) . سه‌ر له ئێواره ئاگاداری دایکم‌و باوکم کرد که بۆ ماوه‌ی نیوسه‌عاتێك ئه‌چم بۆ ده‌ره‌وه بۆلای ( گڵکۆ ) ی هاوڕێم .. دایکم ماچ‌کردو ماڵئاوایم لێ‌کردن هه‌روه‌کو بچم بۆ قوتبی شیمالی .. به‌بێ‌ئه‌وه‌ی باوکم هیچ ده‌نگ‌بکات‌و گوێم‌بداتێ له ماڵ چوومه ده‌ره‌وه .

دوای ئه‌وه‌ی گیروگرفته‌که‌ی خۆمم بۆ ( گڵکۆ ) گێرایه‌وه ، گڵکۆ وتی « تۆ ئه‌بوایه زووتر ئه‌م کاره‌ت بکردایه‌و به منت بووتایه من لای‌که‌س ده‌نگم نه‌ئه‌کردو هه‌روه‌کو « گڵکۆ ـ گۆڕ » بێ‌ده‌نگ ئه‌بووم» داوایشی لێ‌کردم که هیچ زویرو دڵته‌نگ نه‌بم . منیش داوام لێ‌کرد که هه‌مو ٥ ـ ٦ ده‌قیقه جارێك ته‌له‌فۆن بکات بۆ ماڵی ئیمه داوای من بکات‌و بڵی ئه‌و هه‌ر چاوه‌ڕانه‌و هیشتا من نه‌گه‌یشتوومه‌ته ماڵی ئه‌وان .. دوای چه‌ند جارێك ته‌له‌فۆن باوکم‌و دایکم‌شپرزه بوون‌و دایکم ته‌له‌فۆنی کرد که هیچ ڕێی تێ‌ناچێ تا ئیستا من نه‌گه‌یشتبمه ماڵی گڵکۆ ئه‌بێت کاره‌ساتێك ڕووی دابێ بۆیه نه‌گه‌یشتوه .. دایکم به ده‌نگێکی

لەرزۆکەوە ئەم قسانەی بەتەلەفۆن ئەوت بە گلکۆ ••• ئیتر منیش سەرم کردبوە سەر گلکۆ بە پرسیارکردن لێم ئەپرسی ئاخۆ دایکم چۆن قسەکانی ئەکرد بە ناوی تەنها خۆیەوە یان ئەیوت ئێمە ( دایکمو باوکم )•لێم ئەپرسی ئاخۆ باوکم وەزعی چۆن بیت ، پێی ئەوتم بەڵێ ئەویش خەمبارەو شپرزەیە وەکو دایکم •• لێم ئەپرسی ئاخۆ دایکم ئەلەرزی‌و زمانی تیکەڵو پێکەڵ ئەبوو لە تەلەفۆنەکەدا ؟ ؟ گلکۆ بە منی وت هیچ خەمت نەبێ نەخشەکەمان سەری گرتوە •• سەرکەوتووین• گلکۆ ئەیوت مەچۆرەوە هەتا نیو سەعاتی‌تر با بگەڕێن بەدواتاو ئاگاداری پۆلیس بکەن ••• خەمت نەبێ‌و هەمووشتێك بەئاسانی وەرگرە ! بەم‌جۆرە هەتا ماوەیەکی‌تریش لای گلکۆ مامەوە • ئیتر هەستام هاتمەوە •

کە خۆم کرد بەماڵا کلیلی تایبەتی ژوورەکەی خۆمم پێ بوو ••• بەرەو ژورەکەی خۆم چووم کە لەگەڵ دایکمو باوکم چاویان پێم کەوت هەستانە سەرپێ‌و باوەشیان پیاکردمو ئەملاو لایان ماچ کردم•• ئەولاولای یەکتریشیان ماچ کرد !

**لە ئەدەبیاتی سۆڤیەتی‌یەوە**
**وەرگێڕراوە**

# چـــرا ••

« سێ نامەی شیعری‌یە »

شیعری : جەمال غەمبار

نامەی یەکەم

کەگڕ لە گیانت بەر ئەدەن،
تۆ ناسووتێی••
بەڵام لێرەوە دڵی من،
یەك پارچە ئەبێتە قەرەبرووت••
● ئەی جەرگە نەسرەوتەکە
ئەوە دووکەڵی لاشەکەی منو هاوڕێیانە
بۆتە چەترو
لە پشکۆبارانی کینەی ئەوان ،
ئەتپارێزێ••

★ ★ ★

ئەیانەوێ سەرت‌ببڕن،
هەرچەند ئەکەن ،

ناتوانن کاسەی ئەو سەرە چیایی‌یەت
لە لەشت جیابکەنەوە •••
ئەو هەڵۆیانەی لە دڵتـا
بارو بارگەیان خستووە
شەوان کە خەو پێڵووەکانی شار قورس‌ئەکا
سـنووری ئاواییە دوورەکان
بە پێ ئەبڕن
ئەبنە ژیلەمۆی دڵی شـەو•••
لە دارسـتانێ تاریـکا،
چـرای تۆڵـە
بۆ چەند ملیۆن درەختی سەوز پێ‌ئەکەن (١) •••

* * *

ئەم شەوە پڕ تۆف‌و رەهێڵەی بارانەت
لەسەر شانت هەڵـگرتووە
دەرگای دڵت بۆ هەموو کەس مەکەرەوە
نەبا چەتەکان ئەمجـارەش
خوێنە گەشەکەت بفرۆشن••

* * *

رێ تاریکە ، ئەبێ چاوت داگیرسێنی•••
رێگە دوورە ، ئەبێ شەدەی برسێتی‌و
مەرگ ڕاونێی

کرێوەیە ، ئەبێ گیانی چەندان درەختی کەڵەگەت
بسـووتێنی...

لە میانەی « تاریکیی و دووریی و کرێوە »دا..
چەند مـەزنە
زەردەخەنە بۆ لێوی هەڵقرچاوی منـاڵان
لـە ئاسمانەوە دابگری..

* * *

**بۆ « کەمال » ی براو هاوڕێم ...**

**نامەی دووەم**

ئەو هەوارەی ئێستا دروێنەی تەمەنتی تێدا ئەکەی ،
کەشتی یەکی سەرئاوکەوتووی خۆرئاوایە ...
ئاخۆ، تۆ لە تەمی سپی ئاسمانەکەی ئەوا غەرقیت،
یان ئەو لە هەناسەی
غەریبیەکەی تۆدا ئەتوێتەوە ؟!
تۆ لێرەش ، لەم جەنگەڵستانە پڕخوێنە
هەردەم کراسی غەریبیت لەبەردابوو ..

* * *

تۆو سـەدان کەسی وەکو تۆش،
ڕۆیشـتن و،
لێشاوی ئاه وناڵینی چەندان ڕەش و ڕووتتان جێ‌هێشت ..
جانازانم ، خەمی کانیی کوێرکراوەو ،
ژانی باڵندەی کۆچەرو،

ئازاری شەوانی گوندەکانتان هەر لەیادە؟!
ئەوانەی لەژێر ڕەشماڵی دڵیانا،
هەڵگری ئەو خەمو ژانو ئازارە بن
سبەی کاتێ کۆچو باریان
بۆ پێدەشتی ئەم وولاتە پێچایەوە
دیاریی دەستیان،
بۆ دەیجووری ئەم ڕێگایە،
ئەستێرەو مومو
چرایە..!

★ ★ ★

**نامەی سێیەم**

ئەو چاوانە،
دۆزەخێکیان بۆ ناخی ماندووم داگیرساند ..
شەو نییە تیایاندا ،
زەماوەندێك
بۆ سووتانو توانەوەی خۆم،
گەرم نەکەم...

★ ★ ★

دۆینی سیپارەی ئەو هەستەی،
کە لەلای من ( عەشق )ی ناو بوو
لەلای ـئەوـیش
چلێ داری وشکەلاتوو

بووە چنگێ خۆڵەمێش و،
چووە گەرووی بیرەوەری و یاداشتمەوە...
- ئەو - ژانێکی بێپایان بوو
بۆ دوواجار ، ماڵئاوایم لێ کرد

* * *

ئێستاکە «تۆ» لێوت ناوە
بە گۆی مەمکی کانیی هۆنراوەو سۆزمەوە...
ئەو چاوانەی ،
دۆزەخێکیان بۆ ناخی ماندووم داگیرساند
جووتێ ئەستێرەی ئاسمانی
داستانی عەشقێکی تازەن..
جەزم ئەکرد ، ئاسمان هەمووی سەوز بووایە
تاکو هێندە شەیدای ئەو جووتە ئەستێرەیە نەبم..

* * *

« سەیرە، دڵێ بەو بچووکییەی خۆیەوە
جێی ئەو هەموو خۆشەویستییەی
تیا ببێتەوە...
یاخود بەرگەی تووانەوەو گریان و
ئازار بگرێت .. (٢) »

* * *

« هەرگیز ئەم دڵەم (٣) ،
جێگای دووکەسی تیا نابێتەوە »
ئەو کۆترێ بوو، دای لە شەقەی باڵ

حەزی نەئەکـرد
لەژێر سـابات‌و سـایەی دڵێکا••
بحـەوێتەوەو
خۆی لە تەنیایی‌و غوربەت رزگار کـا••
حەزی‌نەئەکرد ، هاوخەمی کەس بێ‌و

کەس هاوخەمی بێ•••

بە بادەی عەشق،
دەماخی سـاردی تۆزێ گەرم بێ•••
ڕۆیی کۆچی‌کرد ••
ئێستا ئەو دڵەی بۆتە وێرانەی
دەستی ڕەشەباو لافاوێکی توند

رۆیی کۆچی‌کـرد••

* * *

تۆ، ئەی چراخانە دوورەکەم•••
ناونیشانی ئەم چیرۆکە تازەیەمی ،
هەناسەی دوورو درێژی
ئەم خەمەمی ••
ئەو لێوانە ،
بۆ بێ‌دەنگیی سڕی کـردوون؟
چی وشـەو رازت لا هەیە، بیدرکێنە•••
بیدرکێنـەو
با ـبێ‌تۆیی‌ـ بە ڕوخسارمەوە دیار نەبێ••

با مانگەشەوی بێنازی ئەم شیعرەشم
بەرگێکی وەك
ڕەنگی چاوانت بپۆشێ•••
تا پێڵووەکانت هەڵبڕی،
لەبەر نیگاتا وشەکان،

سەوز بچنەوە•••

ئەی چراخانە دوورەکەم•••
ئەی هەناسەی
دوورو درێژی ئەم خەمەم•••

**بەغدا ١٩٨٣**

(١) پێئەگەن: دائەگیرسێنن•

(٢) ئیحای عیبارەتێکی ناو شیعرێکی دیکەی خۆمە•

(٣) ناوونیشانی چیرۆکێکی ( عبداللە طاهر ) ە بەعەرەبی ••• ( قلبی لایتسع لاثنین )، بەدەستکارییەوە وەرم گرتووە•

چیرۆك :

# دوو هاوڕێ

گی . دی . مۆپاسان
ئەنوەر قەرەداغی
لە ئینگلیزی‌یەوە وەری گێڕاوە

پاریس تووشی داوی خۆی بووبوو . برسێتی‌و گرانی بەتەواوی دایگرتبوو . ژمارەی چۆلەکەی گوێسەبانەکان هەردەم لە کەم‌کردندا بوو . تەنانەت زێرابەکانیش خاڵی‌بووبوونەوە .. دانیشتووان هەرچی‌یەکیان دەسگیر بووایە ئەیانخوارد .

لە ڕۆژێکی خۆشی مانگی یەکدا مسیۆ مۆغیسۆ کە کاری سەعات چاککردنەوە بوو و پیاوێکی وابوو حەزی ئەکرد شت بەئاسانی لەژیاندا وەربگرێ ، بە مەلوولی‌یەکەوە لەسەر یەکێ لە شەقامەکانی بەرەو دەرەوەی شار پیاسەی ئەکرد ، هەردوو دەستی لە گیرفانی پانتۆڵە سوپایی‌یەکەیدا بوون‌و ورگیشی هیچی تێدا نەبوو ، تووشی پیاوێك هات یەکسەر ناسی‌یەوە مسیۆ سووڤەج بوو کە ناسیاوێکی سەر ڕووباری بوو . پێش شەڕەکە مسیۆ مۆغیسۆ کردبووی بە خوو هەموو بەیانی‌یەکی یەکشەممە زوو هەڵئەساو دارێکی حەیزەرانی بەدەستیەوە ئەگرت‌و سندووقێکی تەنەکەشی لە پشتی ئەبەست‌و بە شەمەندەفەری ( ئەرژەنتویل) ئەڕۆیی‌و لە ( کۆڵۆمبس ) دائەبەزی ، ئەنجا بەپێ ئەڕۆیشت تا ئەگەیشتە دەرپاچە بچکۆلەکەی ناوی ( مارەنتی ) بوو . هەر کە ئەگەیشتە شوێنە لا شیرینەکەی ، دائەنیشت‌و دەستی بە ماسی گرتن ئەکرد تا شەو دائەهات .

شوێنەکە هەمیشە پێش گەیشتنی ئەم پیاوێکی ڕووخۆشی قەڵەوی کورتە باڵای لێبوو کاری کۆنەفرۆشی بوو لە شەقامی ( نۆتردام لـووریت ) و هەر وەکوو ئەم شێتی ڕاوەماسی کردن بوو • زۆرجار نیوەی ڕۆژەکەیان وا ئەبردەسەر قولاپی ئاسن بەدەستەوەو قاچ لەناو ئاوەکەدا لای یەکەوە دائەنیشتن • زۆر زوو بـوون بـە هـاوڕێی یـەکتر • جارجارێکیشـس وشەیەکیان لە دەم نەئەهاتەدەر• هەندێ کەڕەتیش شتێکیان لەبەرخۆیانەوە ئەوت • ئەوەندە هەستو حەزو ناحـەزیان لەیـەك ئەچـوو و لە یـەك گەیشتبوون پێویستیان بە دووان نەبوو لەگەڵ یەکدا •

هەندێجار لە بەیانیانی بەهارا نزیك سەعات دە کە تیشکی خـۆر ئەیدا لەسەر ڕووی ڕووبارەکەو شەوقەکەی لەگەڵ شەپۆلێکدا بەهێمنی بە بەردەمیانا ئەڕۆیشت مسیۆ مۆغیسۆ بە دراوسێکەی ئەوت « جوانـە ، وانی‌یە ؟ » و مسیۆ سووڤەجیش وەڵامی ئەدایەوە : « نازانم شوێن هەبێت جوانتر » • ئەو گفتوگۆ کورتە بەس‌بوو بۆ لەیەك تێگەیشـتن‌و زیاتـر یەکتری خۆشویستنیان ••

پاش نیوەڕوانی پایز کە ڕۆژ بەرەو ئاوابوون ئەڕۆیشتو ئاسمان سوور ئەینواندو هەورە تۆخەکە لە ئاوەکـەدا دەرنەئـەکەوتو لەشـی هەردوو هاوڕێ وەکو پشکۆ ئەدرەوشانەوەو درەختە سوورچووەکانیش لە ترسی سەرمای داهاتوو ئەلەرزین‌و ئەجووڵانەوە ، مسیۆ سووڤەج بـە زەردەخەنەیەکەوە بەمسیۆ مۆغیسۆی ئەوت : « وێنـەیەکی جوانـە لـە بەرچاو » و مسیۆ موغیسۆیش کە سەری لەو هەموو جوانی‌یە سووڕئەما بێ‌ئەوەی چاوی لە قولاپەکەی هەلبڕێ ، وەڵامی ئـەدایەوەو ئەیـوت : « لە سەرشەقامەکان جوانترە • وانی‌یە ؟ » •

هەر کە جووتە هاوڕێ یەکتریان ناسی‌یەوە دەستیان خسـتە نـاو

دەستی یەکترەوەو کەوتنە تەوقەکردن • دڵیشیان بۆ ئەو یەکتری بینینەوەیان لەم بارە جیاوازەی ژیانیانا پڕ بووبوو • مسیۆ سووڤەج هەناسەیەکی هەڵکێشاو وتی : « کەوتووینە چ ڕۆژێکەوە ! » • مسیۆ موغیسۆیش بە دڵپڕی یەکەوە وتی : « ئیمڕۆ چەند ڕۆژێکی خۆشە ! یەکەم ڕۆژی ئەمساڵە » • ئەوە ڕاست بوو چونکە پەڵەهەورێک چی یە بە ئاسمانەوە نەبوو • بەتەنیشت یەکەوە ڕۆیشتن بە پڕ خەمو بیرکردنەوەیی •

ماسی گرتنەکانمانت لەبیرە ؟ » مسیۆ موغیسۆ وتی • « ئای بۆ ئەو ڕۆژانە تۆ بڵێی جارێکی تریان ببینینەوە ؟ تۆ بڵێی ؟ » مسیۆ سووڤەج وەڵامی دایەوە • ئەنجا چوونە بارێکی بچووکەوە شتێکیان خواردەوە هەرزانبەها ، جا کەوتنەوە پیاسە لەسەر شۆستەکە • لەپڕ مسیۆ مۆغیسۆ وەستاو وتی : « ئەڵێی چی جارێکی تر بچینەوە ؟ » • « لەگەڵتم » مسیۆ سووڤەج وتی‌و چوونە بارێکی ترەوە • کە هاتنە دەرەوە پێیانەوە دیاربوو • هەروەکوو کەسێک بەسەر سکی بەتاڵا مەیی خواردبێتەوە • ڕۆژێکی هێمن بوو • هەرچەندە شنەیەکی هەواش باوەشێنی دەم‌وچاوی ئەکردن‌و مسیۆ سووڤەج بە فێنکی یەکە سەرخۆشتر ئەبوو ، لەپڕ وەستاو پرسی :

— بۆچی سەرێک نەدەین ؟
— لە چی ؟
— ڕاوەماسی •
— دیارە لە دەریاچەکەی خۆمان • سەنگەرە فەرەنسەیی یەکانی دەرەوەی شار لە ( کولۆمبس ) ەوە نزیکن‌و من ئەفسەرە فەرمانبەرەکە ئەناسم ناوی (دۆمۆلین) ە • بڕواش ناکەم ڕێگامان

نەدات، • مۆغیسۆش بە دڵپێدانەوە وتی : « باشە وائەکەین» •
ئەنجا هەردوو هاورێ لێك جۆیبوونەوە تا بڕۆن
کەلوپەلەکانیان بهێنن و پاش سەعاتێك بەیەکەوە بەرەوخوار
بوونەوەو ڕێگایان گرتەبەرو زۆری نەخایاند گەیشتنە ئەو
ڤیللایەی بارەگای ئەفسەرە فەرمانبەرەکەی تیابوو •
پاش ئەوەی ئەفسەرەکە تۆزێك بە داوا سادەو ساکارەکەیان
پێکەنی و ڕێگای دان ، کەوتنەوەڕێ • ئەوەندەی نەبرد
سنووری سەنگەرەکانی دەرەوەیان جێهێشت و بە
( کۆلۆمبس ) ی چۆڵکراوا ڕۆیشتن و خۆیان لەسەر
لووتکەی گردێکی پڕ لە ڕەز بینییەوە کە بەسەر ڕووباری
( سەین ) یدا ئەڕوانی • سەعات نزیکی یازدە بوو •

بەرامبەریان دێی ( ئەرژەنتویل ) لە مردوو ئەچوو • لووتکەکانی
( ئۆرگیمۆنت ) و ( سەنوو ) یش لە هەموولایەکەوە دیاربوون و دۆڵەکەی
کە تا ( نانتینگ ) ئەڕوا چۆڵ بوو هیچی تێوە دیار نەبوو • بە درەختە
گێلاسەکانیەوە زەوی خۆڵەمێشاوی ئەهاتە بەرچاو •

مسیۆ سووڤەج بە پەنجە ئیشارەتی بۆ لووتکەیەکی بەرز کردو وتی:
« پرووسیاییەکان لەوێن » • کە تەماشای دۆڵەکەی بەردەمیان کرد ،
موچوڕکێکی سارد بە لەشی هەردوو هاورێدا هات ، ئەمانە هیچ
پرووسییەکیان نەدیبوو ، بەڵام چەند مانگێك بوو ئاگاداری هاتنیان بوون
کە لە هەموولایەکەوە خەریکی وێرانکردن و ڕووتکردنەوەو کوشتن و
برین بوون و بووبوون بەهۆی بڵاوبوونەوەی ترسییەتی و کەس نەبوو
بەرهەڵستییان بکا • هەستێکی پڕ ڕق و ترس بەرامبەر بەو نەتەوە
نەبینراوە سەرکەوتووە بەدڵیانا هات •

مۆغیسۆ بە ترس‌و دوودڵی‌یەکەوە وتی « ئەی ئەگەر تووشی چەند کەسێکیان هاتین ؟ » وەڵامی هاوڕێیەکەی ، سەرەڕای هەمـوو شـتێ ، پڕبوو لە گاڵتەو گەپی ناو شەقامەکانی پاریـس ، ئـەوەبوو وتی : « قاپێ ماسیی سوورەوەکراویان پێشکەش ئەکەین » •

هێشتا هەر حەپەساوی ئەو کپی‌و ماتی‌یە بوون کە لە هەموولایەکەوە هەستیان پێ‌ئەکرد ، کە مسیۆ سووفەج کەوتە قسەو وتی : « واباشـترە بەرەوخوار بینەوە ، بەڵام چاوت با بۆ هەموولایەك کراوە بێت » ، بەرەو ڕووبار داپەڕین • بە چیچکان‌و بە دانیشتن‌و خۆخلیسکاندن‌و بێ‌دەنگ بەناو گژو گیاکانا ڕۆیشتن • تەنانەت چەند جارێکیش دڕك چـوو بـە گوێیاندا • تۆزێکیان مابوو ڕێگاکە ببڕن کەوتنە هەڕاکردن ، تا کەوتنە ناو کۆمەڵە قامیشێـکی وشکەوە • مۆغیسۆ گوێی نا بە زەوی‌یـەکەوە بزانێ گوێی لە ترپەی پێی کەس ئـەبێ ، بـەڵام هیچی بەرگوێ نـەکەوت • وادیاربوو تەنها هەر خۆیان لەوناوەدا هەبوون • قیروسـیایان لێ‌کـردو دەستیان کرد بە ڕاوەماسی •

بەری ئـەوبەری ڕووبارەکەیان بـە دەریاچـە چۆڵکراوەکـەی ( مارەنتی ) لێ گـیرابـوو • چێشـتخانە بچکۆلەکەشـ داخرابـوو • دیاریش‌بوو ساڵەهایە بەجێ‌هێڵراوە •

مسیۆ سووفەج یـەکەم ماسـیی وردیلـەی گرت‌و مۆغیسۆیشـ دووهـەم ئیتر بێ‌ڕاوەسـتان قـولاپەکانیـان هەڵئـەبڕی لەپەسـتا بـەو گیانلەبەرە وردیلانەوە • لەو هەموو ماسی‌یە سەرسام بوون کـەوا یـەك لـەدوای یـەك ئـەگیران • ئـەیانخسـتنە نـاو داوێـکی ئـاوریشـمی هەلواسراوەوە تا بتوانن تیایاندا بجووڵێنەوە لەناو ئاوەکەدا لە بەردەمیانا •

هەستیان بە بەختیاری‌یەکی زۆر ئەکرد ، لەوچەشنە بەختیاری‌یەی ڕابواردنێکی خۆش پاش مانگەها لێ‌بڕانی دەست کەوتبێتەوە •

خۆرە بەپیتەکە شنەیەکی گەرمی هێنا بۆلای شانەکانیان • هیچ دەنگێك لە هیچ لایەکەوە نەئەبیستراو هیچ بیرێکیشیان لەسەردا نەبوو• جیهانیان هەموو لەبیرچووبووەوە ماسی‌گرتنەکەی خۆیان نەبێ • لەپڕ دەنگێکی ناسازی وەك هیی ژێرزەوی دۆڵەکەی هێنایە لەرزین • تۆپەکان بوون کەوتبوونەوە کار •

مۆغیسۆ ڕووی بۆ سەرەوە وەرچەرخاند،بینی لووتکەی شاخەکەی ( ڤالیرین ) دووکەڵێکی سپیی لێ هەڵئەساو یەکسەر کۆمەڵە دووکەڵێکی تریش بەرز بووەوەو گرمەی تەقاندنێکی تریش پاش چەند چرکەیەکی‌کە هات‌و هەروەها هیی‌کەو لە مۆڵەتی نێوان تەقەکانا دووکەڵەکە ئەبوو بە هەورێکی وەك شیرو بەرزئەبووەوە بۆ ئاسمان • « دەستیان پێ کردەوە » مسیۆ سووڤەج وتی‌و ، مسیۆ مۆغیسۆیش کە بە هەموو توانایەکیەوە ئەیڕوانی‌یە قولاپەکەی لەپڕ رق‌گرتی‌و ••• ★ لە هەموو ئەم‌کاتەشدا شاخی ڤالێرین لە گرمەگرم نەکەوتبوو ، وێرانیی بۆ مالانی فەرەنسایی ئەبردو ، ئێسقان‌و خوێن‌و لەشی وردئەکردو ، بۆ دڵی ژن‌و کچ‌و دایکانی شوێنانی‌کەش ئازارێکی زۆری ئەهێنا •

« ئاوەهایە ژیان » مسیۆ سووڤەج وتی •

« بلێ ئاوەهایە مردن » مسیۆ مۆغیسۆ بەپێکەنینەوە وەلامی‌دایەوە •

هەردوکیان لەپڕ داچڵەکین‌و هەستیان‌کرد کەوا یەکێ لەدوایانەوە

---

(★) لێرەدا دە پازدە دێڕی چیرۆکەکە کە دەمەتەقێ‌یەکی پۆلیتیکیی نێوان هەردوو ماسی‌گرەکەیە ، پەڕێنراوە •

ئەجووڵێتەوە • کە ئاوڕیان دایەوە بینی‌یان چوار مڵۆزمی ڕیشداری زەلامی پڕچەك ڕووی تفەنگەکانیان تێ‌کردوون • قولاپەکانیان لەدەس بەربووەوەو ئاوەکە بە ڕووبارەکەدا بردنی •

لە ماوەی چەند چرکەیەکدا گرتیانو فڕێیان‌دانە کەشتی‌یەکەوەو پەڕاندیانە ئەوبەر • لەپشت ئەو خانووەوە کە بە چۆڵیان ئەزانی ، بینی‌یان بیست سەربازی ئەڵمانیی لێ‌بوو و کابرایەکی زەلامی قژدرێژ لەسەر کورسی‌یەك دانیشتبوو سەبیلێکی درێژی بەدەستەوە بوو ئەیکێشا • ڕووی تێ‌کردنو بە زمانێکی فەرەنسەییی زۆر ڕێکوپێك لێی‌پرسین :

« ڕاوەکەتان خۆش‌بوو بەڕێزەکان ؟ » • یەکێ لە سەربازەکان داوە پڕماسی‌یەکەی خستە بەردەمی • ئەفسەرە پرووسی‌یەکەش بە زەردەخەنەیەکەوە وتی : « چاوم لێ‌یەتی ، بەڵام ئێمە شتی‌ترمان هەیە بیری لێ بکەینەوە • ئێوە هەر گوێ لە من بگرنو گوێ‌مەدەنە هیچی‌تر » •

« وەکوو من ئەبینم ئێوە دوو خەفیەن نێرراون چاوێکتان لە من بێت وا من ئێوەم گرتو ئەتاندەمە بەر گوللە• ئێوە خۆتان وا پیشان‌داوە کە خەریکی ماسی‌گرتنن بۆئەوەی مەبەستە ڕاستەقینەکەتان بشارنەوە ، بەڵام لە سیاچارەییتان وا کەوتنە ناو چنگی من • شەڕیش شەڕە • لەبەرئەوەش کە بە ڕێگای خۆتانا هاتوون بێ‌گومانم وشەی پەنهانی‌یان داونەتێ تاکو پێی بگەڕێنەوە بۆ ناو هێزەکانی خۆتان • کەواتە ئێوە ئەو وشە پەنهانی‌یەم بدەنێو منیش ژیانتان ئەپارێزم » •

هەردوو هاوڕێ بە دەموچاوێکی خۆڵەمێشی‌یەوە بەتەنیشت یەکەوە وەستابوون • بێ‌ئەوەی هیچ دەسەڵاتیان بەسەر خۆیانا هەبێ هەردوودەستیان ئەلەرزی • ئەفسەرەکە کەوتەوە قسەو وتی : « کەس

پێ‌نازانێ‌و ئێوەش بێ‌خەم ئەگەڕێنەوە • نهێنی‌یەکەش لەگەڵتان ئەڕوات• ئەگەر بە قسەشم نەکەن هەر ئێستا ئەمرن • ئەڵێن چی ؟ » •

جووتە هاوڕێ بێ‌جووڵە وەستابوون • وتەیەکیان لە دەم دەرنەهات• ئەفسەرە ڕووسی‌یەکە زۆر بەهێمنی‌یەوە پەنجەی بۆ ڕووبارەکە درێژکردو وتی : « لە ماوەی پێنج دەقیقەدا ئەکەونە بنی • تەنها پێنج دەقیقە • لام‌وابێ کەس‌وکاردارن » •

شاخی ( ڤالێرین ) یش هەر گرمەی لێوە دەهات • دوو ماسی‌گرەکە بێ‌دەنگ هەر وەستابوون • ئەڵمانی‌یەکە بە زمانی خۆی فەرمانێکی‌دا ، ئەنجا کورسی‌یەکەی خۆی گوێزایەوە تا زۆر نزیکی دیلەکان نەبێت • دوازدە پیاو بە مەشق‌کردنەوە هاتن‌و لەدووری بیست هەنگاوێك وەستان‌و تفەنگەکانیشیان ئامادەکرد •

« تەنها مۆڵەتی دەقیقەیەکی‌ترتان ئەدەمێ ، زیاتر نا » • ئەفسەرەکە ئەمەی‌وت‌و ئەنجا بەخێرایی هەڵسایە سەرپێ‌و بەرەو دوو ماسی‌گرە فەرەنسایی‌یەکە هات ، دەستی‌دایە باڵی مۆغیسۆو بردیە ئەولاوەو بەئەسپایی پێی‌گوت : « وشە پەنهانی‌یەکەم بدەرێ • وا ئەکەم هاوڕێیەکەشت پێ‌نەزانێ ، ئەڵێم خۆم وازم‌لێ‌هێناون » • مۆغیسۆ هیچی نەوت • ئەنجا چوو بەلای مسیۆ سووڤەجەوەو هەمان‌کاری لەگەڵ ئەویش کرد • ئەویش هەر هیچی نەوت • هەردوو هاوڕێ هاتنەوە شوێنەکەی خۆیان بەتەنیشت یەکەوە وەستان •

ئەفسەرەکە فەرمانێکی دەرکرد • سەربازەکانیش تفەنگەکانیان بەرزکردەوە • مۆغیسۆ بەڕێکەوت داوە پڕ وردە ماسی‌یەکەی کەوتەوە

بەرچاو ، لەسەر گیاکەی نزیکی فڕێدرابوو تیشکی خۆرەکە لێی ئەدان‌و ئەیدرەوشاندنەوە • هەستی بە گوناهباری کرد بەرامبەریان ، لە چرکەیەکا دوو دڵۆپ فرمێسك هاتە سەر چاوانی •

ــ بەدوعا مسیۆ سووڤەج ! بە دەنگێکی لەرزۆکەوە وتی •

ــ بەدوعا مسیۆ مۆغیسۆ ! مسیۆ سووڤەجیش وەڵامی‌دایەوە • ئەنجا پێکەوە تەوقەیان‌کرد • هەموو لەشیان لەسەرەوە تا خوار ئەلەرزی ، بێ‌ئەوەی دەسەڵاتیان بەسەر خۆیانا هەبێ •

« بتەقێنن ! » ئەفسەرەکە هاواری کردە سەربازەکان • هەر دوانزە گوللەکە وەك یەك گوللە لەلوولەی تفەنگەکانەوە هاتنە دەرەوە • مسیۆ سووڤەج وەك پارچە دارێ بەلادا کەوت • مۆغیسۆیش کە لەو درێژتر بوو تۆزێ لەرزی‌و خولایەوە ؛ ئەنجا ئەویش بەلای هاوڕێکەیدا کەوت• ڕووی کەوتبووە سەرەوە بەرەو ئاسمان • چەند دڵۆپێك خوێن لە چەند کونێکی چاکەتەکەیەوە ئەهاتەدەر •

ئەڵمانی‌یەکە چەند فەرمانێکی دەرکرد • پیاوەکانی تۆزێ بڵاوبوونەوە • پاش کەمێك هاتنەوە بە پەتێك‌و چەند بەردێکەوە ، بە قاچەکانی پیاوە کوژراوەکانیانەوە بەستن ، جا هەڵیان‌گرتن‌و بۆ قەراغی ڕووبارەکەیان بردن •

لەوکاتەشدا شاخی ( ڤالێرین ) هەر گرمەی لێوە ئەهات‌و دووکەڵێکی زۆر بەسەریەوە کەپری کردبوو •

دوو سەرباز مۆغیسۆیان لای سەرو قاچیەوە هەڵبڕی • دوانی‌کەش

وایان لە مسیۆ سووفەج کرد ، پاش تۆزێ جۆلانێ‌کردن بە لەشـەکان هەڵیاودانە ناو ئاوەکـەوە • لەبـەر قورسیی بـەردەکان بەقاچا کەوتنـە ئاوەکەوە • ئاوەکە بڵقەبڵقێکی کردو تۆزێ جووڵایەوەو هێمن بووەوە • جارێکی‌کەش چەند بڵقەیەك گەیشتە قەراغی ئاوەکەو یـەك تۆز خـوێن کەوتە سەر ئاوەکە •

ئەفسەرەکە بێ‌ئەوەی هیچ خۆی تێك‌بدات وتی : « ئەنجا نۆرەی ماسی‌یەکانە » و تەماشایەکی وردە ماسی‌یەکانی کرد کە لەناو داوەکـەی سەر گیاکەدا بوون • بانگی‌کرد : « وێلهێلم ! » سەربازێکی بەرگ سپی بەخێرایی هات : ئەمیش داوەکەی بۆ هەڵداو وتی : « ئەم باڵندە بچووکانە روو سوورکەرەوە ، پێش‌ئەوەی بەتەواوی بمرن ، زۆر بەتام ئەبن » •

ئەوجا گەڕایەوە سەر سەبیل‌کـێشانەکەی خۆی •

---

سەر کە جۆشێکی نەبێ ، من زرکەکاڵم بۆچی‌یە !
دڵ کە هۆشێکی نەبێ ، شیشەی بەتاڵم بۆچی‌یە !

**مەحوی**

---

# سەیرکە ؛ من وا لێرەم ! !

**شیعری ژنە شاعیری سۆڤیەتی**
**بێللا ئەخمەدۆلینا**
**وەرگێڕ : عەزیز ڕەشید حەریری**

سەیرکە ، من وا لێرەم ؛
لە سەعات دووەوە ، خەڵاتەکە لەنێــو دەستی مامانــەکەدا شــوێنی
خۆی دەگرێت •••

★ ★ ★

دارەکانی سەر سەرم ئاوازێکی ناسکم بۆ دەڵێن ••
جنۆکەکانیش بە دارە سیحراوی‌یەکانیانەوە یاریم لەگەڵدا دەکەن ؛
منیش لە ڕووناکایی‌یەکی زێڕباودا ، سەرخەوێ دەشکێنم

★ ★ ★

فێری ئەوە بوو بووم لەگەڵ گۆرانی‌خــەوتن‌و شــیعرەکانی پووشــکیندا
بەئاشتی بژیم ؛
بەڵام کە جەنگ بەرپا بوو و هەمووشتێ بوو بە کەلاوە ••
ناردمیانە ئۆراڵ ؛ ئەو شوێنەی کە ڕەنگی نەخۆشــخانەکانی لــە
سپیەتیدا هەر لە زستان دەکات ••
بەڵام لەگەڵ ئەوەش نەمردم ؛
ئەو شوێنەوارانەی کە بە هەوردکانیشەوە لکابوون ؛
دیارنەبوون‌و نەدەبینران ••
کەچی من دەرکم پێ‌کردن‌و زانیم :
ئەم‌شوێنەوارانە هیی ئەوکەسانەن ؛
کە لەپێناوی مندا مردن ؛ کە لەپێناوی تۆدا مردن ••

# فەلسەفەی ژیـان

**شیعری : صەمەد وورگون (*)**
**حەمید کەشکۆل کوورەچی**
**لە ئازەربایجانی‌یەوە وەریگێڕاوە**

کۆمـــەڵ ـ کۆمەڵ ،
باڵندە لـــە پۆلەکانیان دەرئەچن ،
نەوە ، نەوە
مرۆڤیش لە کاروانی ژین لائەدا .
مرۆڤایەتی ،
جـــارێ ژەهر ...
جارێ شەربەت ئەنۆشێ ...
نەخشی سروشتە وای ئەنجامداوە ،
ئاسمانیش نهێنی‌یەکی بەهێزی وای هەیە ...
دەستی گـــەردوون
کـــە ڕەوڕەوەی ژینی ئاکارداوە
هـــەندێ پڕ گریان ...
هەندێ پڕ خەندە ..
هیوا مەزنەکانی مرۆڤ ؟

هەندێکی شێر ئاسا ••
ڕووەو سەختی هەڵمەت ئەبەن
هەندێـــکی •••
سەرلێ‌شێواوی ئامێزی ئەگرێ ••
هـــەردەم ،
ئاوەکان ڕێڕەو ئەگۆڕن ••
بیرو هۆش ئەگۆڕێن
ئەندێشەکان •• هەڵئەدەنەوە
گیانەوەر •• لە جێ‌یەکدا ناسرەوێ ،
سنگی لە بەرد ئەدا ••
ئەوســـا ••
جارێ لە زستان •• جارێ لە بەهار
دەرئەچێ •••

* * *

ئەی ئەو پەری‌یەی (خۆشی)ت ناوە !
وەرە !•• بە هاودەنگەکانت بڵێ :
بەداخەوە ••
تا ئێستا مرۆڤایەتی بە هیوا نەگەیشتووە •••
ئەی شۆخی جیهان !
مەتۆرێ لە مرۆڤ ،
ئـــەو ••
چاکەو بەدکاری جیائەکاتەوە ،••
وەرە !

نەکەی عەشقی ، بێنرخ بگری ••
دڵدارە •• هەستیارە •• بەسۆزە ••
هەرگیز ئەستێرەی ناکوژێتەوە ••

★ ★ ★

مەرگ شەیتانێکە •• ژیان شاهێ !••
( ماڵو دارایی ) سێبەرمانە •••
ئەشێ ••
ڕووناکی دەست لە ملی تاریکی بکا ••
ژین لە ژیانا ، ئێمەی ئەوێ ••
خۆریش سەر بۆ بازوومان ••
دادەنەوێنێ •

★ ★ ★

چاکـــەو بەدکاری ،
ڕووبەڕوو وەستاون ••
ئەمە لە دێرزەمانەوە
میراتی ئێمەیە ••
لـــە دڵمانا ، بەهار دیلە ••
کەچی لەپشتییەوە
زستان کفنی لەبەرکردووە ••
نەخشی سروشتە وای ئەنجامداوە •

★ ★ ★

خۆشی جیهانێ
تاڵیش جیهانێ ••

بەڵام ژیان
هەمیشە ئەسپی خۆی تاوئەدا ؟
دیمەنێکی دڵفڕێن
لە جەرگەی ئاگرا نیشانئەدا ••
پەڕوباڵی نوێ
بە ئەندێشەکان ئەدا ••

★ ★ ★

شاباڵی هەستی مرۆڤ •••
دووبارە ••
لە ئاسمانا ئەسووڕێتەوە ••
لە دەریا شینەکانا مەلەئەکا
ئەی شەفەقی نیگا شیرین !
هیوای پاکی مرۆڤ لەئامێز کە ••
دەستی جوانیو هونەر
بەسەر خاکا درێژکە ••
فریایکەوە !
بێهوودەیە ، بیمارە ، هیوای بێهونەر
هونەر ، هێزو توانایە ••
با باڵ بدا بە زیندەوەر
ڕێگای کاروان ڕوونکاتەوە ••
با باڵ بدا بە دارو بەرد ••
سەرانسەر دەریاکان لەتبکا ••
لەشکری ئازادی بگاتە نزرگەی خۆی ؛
داستانی سەرکەوتن بکرێ بە یادگار

بمرێ مەرگ !

بژی ژیان !

بەناووبانگیمان لە جیهانا کردارێکە ••

کە شەوەزەنگمان کتووپڕ ڕووناك ئەکردەوە !•

با بمرێ شەیتان !

با چاکە لە ناخی دڵەوە

هـــاوار بـــکا

با کۆتو زنجیر بپسێنین !

بەسەرچوو ••

نەمـــا دەستی چەپەڵی ئازار

ئێسكو پرووسکی بە مستێ

ئەپووکێتەوە ••

چونکە خۆشی گەنجی‌یە

هەردەم ئەبووژێتەوە ••

عەشقی ژیان لە چاویا ئەدرەوشێتەوە ••

با بژی دوارۆژمان !

با بژی بەهار !

---

(★) سەمەد ڤۆرگون ( یا وورگون ) ، کە بە ( وەکیلۆڤ ) یش ناسراوە ، لە نیـوەی یەکەمی ئـەم سەدەیەدا بە شـاعیری گـەورەی ئازەربایجانی سۆڤیەتی دانراوە • ئەم شاعیرە ، با کوردیشـی نەزانیبێ ، شانازیی بەوەوە کردووە کە کوردە • ئەم ڕاستی‌یە لە شیعرە کانیشـیا ڕەنگی‌داوەتەوە • دەیوت (کورد مووسا) ـ کـە قارەمانی داستانێکیە ـ وێنەی باوکمە • خۆزگە ئەم لایەنانەی شیعرەکانی ئەکران بە کوردی •

# مامۆستا سەجادی
# خەرمان بەرەکەت !

ممتاز حەیدەری

(١)

● گەورەم !

نازانم چۆن ڕێگا بە خۆم بدەم ، وەك خوێندەوارێکی کورد ، دوو ووشەی ئەمەکداری نەك دەربارەی هەموو بەرهەمەکانت بکەم کە هەموویان شاکارن‌و بەهیچ جۆرێك ئەو ڕەوسە گەورەیە بەمن بر ناکرێ !! بەڵکو تەنیا ، بەڵێ «تەنیا» دەربارەی پێشەکی‌یەکەی بەرگی هەشتەمی ڕشتەی مرواری کەخۆی لە خۆی‌دا نیشانەی گەلێ مەسەلەی گەورەو بچووك ، ڕوناك‌وتاریك ، پاشکەوتن‌و پێشکەوتنی مێژووی ڕەوتی ڕۆشنبیری‌و ئەدەبی کوردی‌یە ، لەسەرووی هەمووشیانەوەم هەتیوی‌و بێ‌کەسی کەلەپووری نەتەوەییمان کە ئەم مەسەلانەش تێکڕا ڕەنگدانەوەی مێژووی نەتەوایەتی‌و کومەلایەتی‌و ڕۆشنبیری کوردن‌و هەویرەکە ئاوێکی زێدە زۆر هەڵدەگرێ .

● گەورەم !

بێ‌گومان ئێوە ، لەئەنجامی دڵسۆزی‌و شەونحونی‌و لێهاتووی خۆتانەوە ، کەلێنێکی گەورەتان لە ڕەوتی ڕۆشنبیری‌و ئەدەبی نەتەوەی

کورد پڕ کردۆتەوە •• ئەمەش قەرزێکی زۆر گەورەیە بەسەرمانەوەو هەرگیز پێمان ناژمێردرێ و پێمان نادرێتەوە ! ئەم سەرمایە مەزنە پەیکەری نەمری سەدان ساڵی دوارۆژ دروست دەکات •

● **گەورەم !**

لە ناخی ناخەوە ئاوات دەخوازین تەمەنت درێژ بێ و لەشت ساغ و ڕووباری بەرهەمەکانت ئەستوورترو ڕوونتر بێ ، بەتایبەتیش ڕێچکەی کاروانی شکۆداری « ڕشتەی مرواری » بەرینترو نەپساوتر بێ •

**حەزرەتی سەجادی !**

وەکو لە پێشەکی «ڕشتەی مرواری»دا دەفەرمووی :

« وەکو هاتنەکە پیاو بە ئارەزووی خۆی نەبووە ، چوونەکەشی هەر بە ئارەزووی خۆی نی یە » • منیش دەڵێم وادەبێ « حەزرەتی عزرائیل » لە ناوەندی شەقامدا پشتی ملی پیاو بگرێ و لە عەردی بکوتێ ، جا دەستم دامێنت و بە پیرۆزی و مەزنایەتی کەلەپووری نەتەوەیمان ، تا پێت دەکرێ ڕۆژێك زووتر بەشەکانی دیکەی ڕشتە بڵاو بکەوە تا (پلارهاوێژەکان) زیاتر شەرمەرازی دایان گرێ و وەچەی نوێش زیاتر شانازی بە ڕابردووی دێرینی خۆی بکات و داهێنەرانە بیکا بە هەوێنی پێشکەوتنی ئەدەبیاتی ئەمڕۆ و دوارۆژمان •

(٢)

● **خۆێنەری خۆشەویست !**

ئاشکرایە تا ئێستا دەیان بەڵکو سەدان ووتارو لێکۆڵینەوە دەربارەی ژیان و هەڵوێست و بەرهەمی چەندان ئەدیب و نووسەرو شاعیری

هاوچەرخ‌و کۆچکردوو نووسراوە ، بێگومان ئەو بەرهەم‌و لێکۆڵینەوانە بە پێی سەنگی خۆیان ، کەلێنی تایبەتی خۆیان لە کتێبخانەی کوردیدا پڕکردۆتەوە ، بەڵام ئەوەی مایەی داخ‌و سەرنجە ئەوەیە کە شوێنی مامۆستا سەجادی‌و بەرهەمەکانی ئەوەندەیان بەرنەکەوتوە کە شایەنی باس بێ‌و ببێ‌بە سەرچاوە ! بە تایبەتی زنجیرەی « ڕشتەی مرواری » کە گەیشتۆتە هەشت بەرگ . هەڵبەت ، بە هیچ‌جۆرێك ، ناوەڕۆك‌و ڕوخساری ڕۆشنبیری‌و ئەدەبی‌و دەروونی‌و کۆمەڵایەتی‌و زمان‌و زمانەوانی و مێژوویی‌ی «خەرمانی ڕشتەی مرواری» بە ووتارێك‌و دوان‌و سیان ... و ... بە چاکی باس‌ناکرێ‌و هەقی ڕەوای خۆی نادرێتێ بەڵکو پێویستی بە دەیان لێکۆڵینەوەی فراوان‌و قووڵ‌و زانستانە هەیە ، ئەویش بە بێ ڕاو تەگبیرو نەخشە ناکرێ ، بۆیە من وا پێشنیار دەکەم کە کاتێکی تایبەتی دیار بکرێ‌و «سیمینارێکی گەورە» ی چەند ڕۆژی سازبکرێ‌و لەو سیمینارەدا لە بەرهەمەکانی مامۆستا سەجادی بەگشتی‌و هەشت بەرگەکەی ڕشتەی مرواری بە تایبەتی ، بکۆڵرێتەوە . بە واتایەکی‌تر ، ئەم سیمینارە بکرێ بە میهرەجانێکی گەورەو قەشەنگ بۆ ڕێزگرتنی مامۆستا سەجادی کە زاناو ئەدیبێکی نەتەوەپەروەری کوردی ـ کەم‌وێنە ـ یە .

ڕاستی ، ئەم ئەرکە قورسەش لە وزەی تاکە کەسێك نی‌یە بەڵکو لە توانای دەزگایەکی ڕۆشنبیری سەر بە دوەڵەتە وەك « ـ دەستەی کورد ـ لە کۆڕی زانیاری عێراق ، دەزگای ڕۆشنبیری‌وبڵاوکردنەوەی کوردی ، ئەمێنداریتی‌ی گشتی‌ی ڕۆشنبیری‌و لاوان » . بەلای منەوە ئەگەر یەکێك لەم سێ دەزگایە ئەم ئەرکە پیروزە بگرێتە ئەستۆ ، دەتوانرێ کاتێکی لەباری بۆ هەڵبژێررێ‌و ئەوکاتە پێویستە دەستبەجێ

لیژنەیەك بە ناوی « سیمیناروو میهرەجانی سەجادی » پێك بهێنرێ بۆئەوەی هەر زووبەزوو هەموو هەڵو مەرجی سەرکەوتنی پرۆژەکــــە دەست نیشان بــکات •

(٣)

● ئەی کوردینە !

تا ئەم پێشنیارە (ئاواتە) ، بە هیممەتی دڵسۆزان بەئەنجام دەگات ، وەرن با هەموو ئاوات بخوازین کەتەمەنی مامۆسـتا سـەجادی درێژتر بێتو هەمیشە هەر لەشی ساغو بەرهەمی فرەتر بێت •

(٤)

● گەورەم سەجادی !

تا ئەم میهرەجانە بە چاوی خۆت دەبینیو گیـــانو هـــەستی کوردەواریی بەرهەمە ڕەسەنەکانت دەبێ بە زاخاوو ڕێنیشاندەری کاروانی کورد ، دەڵێم :

**خەرمان بەرەکەت**
**لە ژیانو بەرهەمەکانت !**

# سێ بارانە ڕۆژ

« ئـەرخەوان »

– ١ –

بارانە ڕۆژێ بوو غەمگین
ئاسمان مات‌و زەوی بێدەنگ
چاوەکانت لەجێی خۆرێك
دوو خۆر بوون‌و
منیش دڵم
تەواو تاریك .
ئەی چاوەکان !
وەختێ لـــە دڵما هەڵهاتن
بەفری خـــەمم
نەك توایەوە
بووش بە هەڵم .

★ ★ ★

خەندەی لێوت
کانیاوی کەللەتەزێنی کوێستان بوو

منیش ڕێبواری شەکەتی
ڕێگەی هـــاوین
عاشقت بووم بەڵام عەشقت
عەشق نەبوو
شۆرشێ بوو
گیای سوورو ئاسمانی سپیو
گوڵی رەشی داوا ئەکرد

* * *

سەرانسەری باخچەیماڵان
گوڵی ڕەشە
دەشتو چیـــا
وەك مافوورو وەك دیواری
سوورە گیایە
بەڵام ئاسمان نەگۆڕاوە
بۆیە عەشقت عەشق نیەو
سەودایەکە زۆر نەهێنی
بێجێو ناوی
ئەم بارانە رۆژەی تیایە

– ٢ –

بارانە رۆژێـکە غەمگین
زەوی لە قوڕ پێواندایە
ئاسمان دایکـێکە پرچسپی

بەسەر ئەودا ئەگری‌و ئەگری
تا ئێستاکە چاوەکانت
وەك دوو مۆمی کوژاوەیە
خەندەی لێوت دەمێ وەریو
دەمێ مەییو
منیش دیلی چوار دیواری
هەتاو نەدیو
ڕقم لێتە !
چونکە عەشقت عەشق نەبوو
شۆرشێ بوو
دۆڕاو ، بەزیو

— ٣ —

بارانە ڕۆژی بەهارە
ئاسمان تووڕەیەو دائەکات
مرواری تەرزە ڕۆئەکات
ئەوا ئێستەش چاوم لێیە
خۆری ، زوڵفو پەرچەم زیوین
یێخەی تەمومژ دائەدڕێ
دڕ بە گەواڵە هەور ئەدات
بۆ شاری یار پێ ئەکەنێ‌و
بەرەوپیری ئەو ڕائەکات
لەدوایشدا

چەتری زیڕین
لەسەر سەری عاشقانی شاخ
هەڵئەدات
زامی لەشی کوڕی عاشق
سورەو شینەو خوێن لێ تکاو
بۆیە کچان چەپکە هەتاو ،
دیاری دەستیان
ئەدەن لـــە سنگ‌و بەرۆکو
ئەدەن لـــە قژی دەزگیران •
زامی لەشیان
بە تاڵە پرچی هەڵکەنراو
ئەچننەوە •
وەختێ خوێنیش بوو بە سووراو
ئەوسا جووت جووت
دیسانەوە ڕێی ژوانی
بارانە ڕۆژ ئەگرنەوە •

۱۰ – ۳ – ۱۹۸۲

# کاتێ ژوان ئەکرێ بەدیاری ...

د. هیوا عومەر ئەحمەد

هێدی هێدی بەتەنیا ، تولەڕێ کەی گرتبووەبەر ، کە نمەی بارانەکە ئەیدا لە ڕووی ، تەزوویەکی بە لەشیدا ئەهێناو پێلوەکانی پێ لێك ئەنا ، هێمنیو شادی دەموچاویان لیپ کردبوو .

« نازانم بۆ هێندە دڵم بە باران ئەکرێتەوە ؟ »

بە چمکی پڕیاسکە پێچراوەکەی بنهەنگڵی دەموچاوی سڕیو سەرێکی بڵند کردەوەو لە بەرزی ڕوانی .

« بارانو یادگارەکانم ئاڵودەی یەکن ، ڕۆژێکی باران بوو لاوەم ناسی ، ئای لاوە گیان وا نەمردم بە دیدارت شادئەبمەوە » .

هەناسەیەکی وەك هەنسکی پاش گریانی هەڵکێشا ، بارانەکە نەرمە ئاوڕشێنێکی زەوییەکەی کردبوو ، دڵۆپی بارانەکە خۆیان بە زەوییەکەدا ئەماڵیو کەمێ تۆزیان ئەکردو لە ئامێزی والآی خاکەکەدا ژیرئەبوونەوە .

« لە ڕۆژێکی باراندا بوو لە لانەیان تەراندی » .

کرزییەك دەموچاوی داگیرکرد ، چرچێ کەوتە نێوان

برۆکانی‌یەوە • دامێنی کراسە شۆڕەکەی هەڵکرد ، بەپارێزەوە پێی بەسەر جۆگەلەکەدا هەڵهێنا • کانکێشکەرەی دیمەنی [ دارە گەورە] سەرنجی ڕاکێشا • نیگاکانی بە چەندان داوی نەبینراوەوە بەو گوزەرەوە بەسترابوون • چەند هەنگاوێکی مابوو بگاتە لای ـ دارە گەورە ـ ؛ لاوێکی جل‌وبەرگ خاکی لەپاڵ دارەکەوە ئاشکرابوو • بەپیری‌یەوە هات ، بێ‌ورتە دەستیان خستە ناو دەستی یەك • چاوە بەلەکەکانی بڕی‌یە چاوەڕەشەکانی ـ لاوە ـ ، پاڵی‌دا بە دارەکەوە ، دایە پڕمەی گریانێکی بەکوڵ ، لاوە شانی گرت‌و بەخۆیەوە نوسان ؛

« سێوە گیان »

بە هەنسکی گریانەوە ، بە دەنگێکی بەسۆزەوە وەڵامی‌دایەوە ـ « پەڕەی دڵەکەم لاوە » •

شانۆکە تاریك‌و دیمەنەکان تەماوی بوون ، گەردەلول بە گفەگف مێردەزمەکانی گەیاندەجێ ، دێوەزمەکان پیادە بوون ، بەو دەوروبەرەدا بڵاوبوونەوە ، خۆیان مەڵاس‌دا ، کەڵبەیان بۆ دیمەنەکە تیژئەکردەوە • شانۆکە بووە ڕاوگەی کەوان ، مۆتەکە زەردەواڵاوی‌یەکە بەپارێزەوە لە دارە گەورە نزیك‌بووەوە ، چەند مێردەزمەی دواکەوتن ، چڕنوکیان لێ ڕووت‌کرد ، هەور گرماندی •

« کەوی یاخی دەستەمۆ بە ، کەوی نەبی ، هەورە بروسکەت ئەکەینە دیاری » •

هوشیار بووەوە • هەرچەند ئەیزانی کار لە کار ترازاوە ، کەڵبەی مێردەزمان چەپەرە لە گشت لاوە • بەڵام وەك ئاسکی سڵ‌کەر ، دەستی‌دایە باڵی (سێوە) • پشت لە ئاوایی‌و ڕوو لە هەردەو چۆڵ دایان لە

شەقەی باڵ • دێوەزمەی زەردەواڵە بەشان توڕە بوو ، خۆی نەخواردەوە جامی قینی بەسەریاندا ڕژان ، هەور گرماندی •

« نەیەڵن بێدیاری قووتار بن ، بروسکەیان بکەنە دیاری » •

شریخەی هەورە بروسکە ، چزەی لە گیانیان هەڵساند •

گەرمی یەکەی لاشەی ساردکردنەوە ، نمەنمی بارانەکە ڕەنگی جێبروسکەکەی ئەشتەوە ، خوناوەکەی تینوێتی خاکەکەی کزرئەکردەوە ، ئەو گریانە سەبوری بە دڵی توێتوێی ـ دارە گەورە ـ ئەدا ، لەوساتەوە دەنگی خرمەی باران ئەو سەرگروشتەیە ئەگێڕێتەوە ، بەڵام تەنیا کەویاران گوێی شانازی بۆ شلئەکەن •

---

ڕەببی مووی لێ بێ زمانی ، پەنجەکانی هەڵوەرێ
هەرکەسێ گوڵشەن بە چەشنی کوڵخەنی دۆزەخ بەرێ

ـ حەمدی ـ

---

# کاتێ سروشت تووڕە دەبێ !

مەدحەت بێخەو

(١) بانگی ڕووبار

کاتێ ڕووبار هەڵئەچێت و
بانگ و هاوار ئەپەخشێنێ
والآیە چی ئەدرکێنێ
بەڵام کزی ورەو هانا
وەڵامی بانگ ئەخنکێنێ
بۆیە هەمووساڵی ڕووبار
لــــە نەوبەهار
لــــە سەیرانکار ..
تووڕە دەبێ و دەقیژێنێ !

(٢) دارســـتان

کـــە دارستان خۆی سووتاندو
شوێن بوو بە خۆڵ
پرسیاریان کرد لە ڕەگەکان
چی بوو هۆی ئەم کارەساتە ؟
گوتیان لەدژی دێوجامەو(١)
(کـــەو)انی زۆڵ .!

(٣) دەسکی تەور

لە دێیەك دەسکەتەورەکان
گوتیان سوێند بێ ..
چیتر نەچین بۆ دارستان
نەبین بە قەڵەمو تیرۆک
بە داری پیمەڕەو کەمان ..
بەم هەواڵە گورگو ڕێوی
مردن تۆقان .!

(٤) ڕێژنە

لە کویستانان کاتی زستان
وەرزەکەی زۆر دەخایێنێو
بەستەڵەکی نابڕێتەوە
ڕێژنەی بەهار تووڕە دەبێ
تا گوڵاڵە بڕوێتەوە
بەگوڕ دەباریو دەباری
تاکو سەهۆڵی هەردو کێو
بەجاری ئەتوێنێتەوە .!

---

(١) دێوجامە = ئەو پەردەیەیە کـــە وێنەی کەوو باڵندانی تێدایەو
راوچی بۆ ڕاوی کەو بەکاری‌دەهێنی .

# سـەفـەر

سـەلاح عومـەر

دە ساڵ پێش ئێمشەو ئێرەم جێهێشـت • ئەوا جارێـکیدی پـێ دەنێمەوە هەمان کۆڵان • هەر ئێسـتا خۆڵو خاکەکـەی بۆندەکـەم ، ئەوانیش ماچمدەکەن • دیوارە لە قوڕ دروستکراوەکان ، خانووەکان ، فرمێسکی بێئـارامیو ژانی دووریو سووتانم دەسـڕنەوە • دەرگـاو ماڵەکان ، هەمووشتێ وەکو خۆیـەتی نەگۆڕاون ، ئـەوەتانێ جـۆگەلە باریكو خـوارو خێچـەکەم لێ دیـارە • کۆنە پـەڕۆو ووردە بـەرد پڕیکردۆتەوە • لێرەو لەوێش پەنگاوەتەوە • جاران دەبوایە هەمـوو ڕۆژێ ئافرەتێك یا پیاوێك خۆی لێ هەڵبکاو بە خاکەناز پاکی بکاتەوە • بەڵام ئاخۆ بۆ ئێمشەو پاكنەکراوەتەوە ؟ دەبێ چێ ڕێی لێ گرتبن ؟ لەوانەیە خەڵکەکەی تاقەتی جارانیان نەمابێ • یا کۆمەڵە خێزانێکی دی شـوێنی گرتبنەوە• هەمووشتێ دەبێ• کەس لە جێی خۆی نامێنێ• ئیمڕۆ لێرەی ، سـبەی لە شوێنێـکیتر ••• لەخـوار شـوێنی بەنگانەوەی یەکەمی جۆگەلەکەش • چاڵێ هەبوو • ئەوەتە دیارە • قووڵتر دەبینرێ ، پانو بەرین کراوە • وادیـارە ئێستا بۆ شـتیتر بەکاردێ • ئەوەتا چەندەها قوتووی بەتاڵ •• پاشماوەی خواردەمەنی •• کیسەی نایلۆن •• وردە شووشە •• خۆیان تێیدا متکردوە • بۆتـە گوفەك ، بۆگـەنی لێ دێو

خەریکە مێشکم هوڕدەبێ ـ کە لەوێش دەسوڕێتەوە، ڕیزە دووکانەکان دێنە بەرچاو ، سێیەمین دووکان هی سەوزەفرۆشێو چوارەمین هی کووتاڵفرۆشێ بوو • نازانم لەجێی خۆیانن یا نەء ؟ ئاخۆ پیرەمێردە بەساڵاچووەکە ماوە ؟ یا ئەویش مەرگ پەلەکێشی کردوە • کابرایەکی شەست حەفتا ساڵان دەبوو • گەلێ‌شتم دەربارەی بیستووە ، گوایە لە گوندەکەیان لەگەڵ ژنێ دەست تێکەڵ دەکا ، پاش ئاشکرابوونی کارەکە ژنەکە دەکوژن‌و ئەم بەرناکەوێ • لەترسا سەر هەڵدەگرێ‌و لێرە دەگیرسێتەوە • هەر لێرەش ژنی هێناوە • چوار منداڵیشی هەبوو ، سێ کوڕو کچێك • کوڕەکانی گەلێ بێ‌بەزەیی‌یانە لەگەڵی دەجوڵانەوە ، ماندووبوون‌و شەونخونی هەر بۆ ئەو بوو ، نەمدیت ڕۆژێ بەسەر دووکانەکەی باوکیان ئارام‌بگرن •••

سەرتاشێکیش لەتەنیشت پیرەمێردەکە بوو • ناوەکەیم لەبیرنەماوە، کوڕێکی قۆزی ڕووخۆش دیاربوو • هەمووجارێ کە بەوێدا تێ‌پەڕیبام ، بەگەرمی بانگی دەکردم :

ــ « دانیشە ، چایەك •• ساردەك ، لەخزمەتین » •

لەوبەریش قەسابێکی ورگ‌زلی سمێڵ‌فش ، بە قسە قۆڕو بێ‌ماناکانی ڕووبەڕووت دەبۆوە ، کابرایەکی ڕووگرژو چاوزەق بوو ، هەمووساتێ مۆنی‌و خەواڵوویی‌و چاوسووری لەڕوخساری ڕەنگی‌دەدایەوە ، ڕقم لێی دەبۆوە • خۆشم نازانم لەبەرچی نەمدەویست بیبینم ؟ کە دەمدیت تووڕەو پەست دەبووم • گۆشتم لەو نەدەکڕی • دەچوومە بازاڕ • باکم بە ڕۆیشتن‌و دووریی بازاڕ نەبوو ، تەنیا دەمویست نەیبینم جا هەرچی بێ‌و کوێ بێ گرنگ نەبوو لام •

دووسەد مەترێ لەوێش هەنگاوت دەناو بەناو خۆڵ‌و بەردو چەودا

دەڕۆیشتی ، وەردەسووڕایەوە ، یەکسەر دەرگای قوتابخانەکەمان سەرەنجی ڕادەکێشای • لە ڕۆژئاوای دیواری پشتەوە ، سووچێکی تەنیاو چۆڵو باریکە ڕێیەك دەیبردیە سەر شەقامەکە • منو میدیای کچی مامئەحمەد لەو سووچەدا ، بە دەیان جار تووشی ترسو لەرزو چاوەدێریی خەڵك دەبووین •

بەیانیان زوو بەوێدا دەڕۆیشتین ، ئەو برۆ من بەدوایەوە بیست مەترێ لەپێش منەوە هەنگاوی دەنا ، بەشێوەیەکی سەیریش نامەکانمان دەگۆڕی‌یەوە ، چەند ئاوڕێکی خێرا بۆ ئەملاو ئەولا ، کاغەزێکی نووشتاوە ، فڕێدەدرایە خوارێ • ئەوسا تیژ تێی‌دەتەقاند ••• تا ئەوساتەی لە سەربان دەمدیتەوە ، ئاگام لێی دەبڕا • ئێستاش بەبیرمدێ چۆن نامەکانم هەڵدەگرتەوە • سەربانەکانیشمان دەیڕوانی‌یە یەك ، ئێواران بە ئیشارەتو دەستهەڵبڕین یەکترمان تێدەگەیاندو بەڵێنەکانمان تازە دەکردەوە •

— « بەیانی سەعات حەفت لە هەمان شوێن » •

نەماندەوێرا لە بەردەرگا سەیری یەکتر بکەین ، چونکە کۆڵان بە ڕۆژ دەپنگایەوە • پێش هەر دەرگایەك کۆمەڵە ئافرەتێ بە خۆیانو تۆپەڵە بنێشتی دەمیان وەکو حەسحەس تێتڕادەمان ، گرێکوێرەی نهێنی‌و باسو خواسی ناسیاوو نەناسیاو بەوان دەکرایەوە •

جا چۆن یەکتر ببینین • خۆ کە بەتەنیاش بەوێدا تێپەڕیبام ••• لەشەرمان ئارەقەی ڕەشو شینم دەکرد •

جاران کۆڵانەکەمان بە شەو تاریکی باڵی بەسەردا دەکێشا • تەنیا دوو گڵوپ ، یەکیان لەژێر تارمەی بەردەرگای ماڵی حاجی ئەحمەد ،

ئەوی‌دیش لەوسەر ، ئێستا ڕووناك بۆتەوە • ئـەوەتانێ ڕیزە دارتەلێـك
چەقێنراوەو گـڵۆپەکانیشی داگـیرساون • هەمووشـتێ لەبـەر تیشـکی
گـڵۆپەکاندا بـەجوانی دەبینرێ ، دەرگاکەی خۆمان هەمان ڕەنگی پێوە
ماوە ، نەگۆڕاوە • ڕەنگێکی کەسکی تۆخ ، چەندەها جار بە باوکم گوت
ئەم ڕەنگە بە ڕەنگی شین یا پەنبە بگۆڕێ • گوێی نەدامێ • حـەزم لـە
ڕەنگی تۆخ نەدەکرد ، پێی تووڕەو خەماوی دەبووم ، شەیدای ڕەنگی
کراوە بووم ! لە درزی دەرگاکەوە بڕوانیتە ژووری هەمووشتێ دەبینی•
پاش کەمێکی‌تر لێی نزیك دەبمەوە ، ئەوسـا لە درزەکانـەوە سـەیری
حەوشەکە دەکەم ، بەڵام کێ دەڵێ ماڵمان لێرە ماوە ؟ خانووی خۆمـان
نەبوو ، هی کابرایەکی ڕەزیلی قرچۆك بـوو لەوانەیە فرۆشتبێتی ، یـا
کرێکەی زیاد کردبێ‌و باوکم توانای پارەدانی پتری نەمابووبێ ، ئەوسـا
جێی هێشتبێ ! !

ڕەوشتێکی سەیرم هەیە ، نازانم بـۆ کە بیر لە باوکم دەکەمـەوە
قاچەکانم دەلەرزن • هەستی بریـنداری‌و دڵتەنـگی‌و هەناسەسـواری
دەموروژێنێ • کە بیریشـی لە نازداری خوشـکم‌و سـەرداری بـرام
دەکەمەوە هەستی خۆشی‌و کامەرانی ختۆکەی گیانم دەدا • چەند خۆشە !
خۆشکەکانم ، سەرداری برام لە ئامێز دەگرمەوە • ئاخۆ چـۆن بن ؟ !
گەورە بووینە ، ئا بەڵێ گەورە بووینە ؟ ئاسایی‌یە ، دە سـاڵ تەمەنێـکی
کورت نی‌یە • بەژن‌و باڵا ، ڕوخسار ، دەنگ هەمووی دەگۆڕێ• نازانم
لە قوتابخانەش چی‌یان کردوە ، گەیشـتوونەتە کوێ ؟ بەپێی سـاڵ بـێ
دەبێ سەردار دووی ناوەنـدی‌و نازداریش چـواری دواناوەنـدی بێ ؟
خۆزگە بەردەوام ئەم هەستە گیانم بگرێتەوەو جارێکی‌دی تێکەڵی جیهانی
لێك‌دابڕان‌و ڕوخساری خەماوی‌یان نەبمـەوە !! ڕووگرژیی باوکیشـم
هەر مەپرسە • ئاخۆ چۆن تابلۆیەك ئەمجارە لە بەرچاوم قیت‌دەبێتـەوە ؟

دنیایەکی سەیرو ژیانێکی تاڵمان هەبوو ، هەتا کەلوپەلی ژوورەکانیش گلەییان لێ دەکردین • هەر کە بەیانی دەبۆوە ، شەڕ ، قیژەقیژ ، هاوار هاوار گوێی دراوسێکانی کاس دەکرد • لەوانەیە ئیستا ئەم هەرایە بڕابێتەوە ! لەوانەشە نەء ! ؟ باوکم پیر بووەو تاقەتی ئەم بەزمەی نەماوە ، بەڵێ پیری خووڕەوشت دەگۆڕێ ، پیاو هێمن دەکاتەوە • توندو تیژی ناهێڵێ • بەبیرمە چەند جار هەوڵی خۆدزینەوەو سەری خۆ هەڵگرتنم دا ، خۆکوشتن ببووە ویردی سەر زمانم • مێشکم بە دەیەها پیلانو نەخشەی سەیر قاڵببوو • تا ئەوشەوەی بۆ هەمیشە سەری خۆم هەڵگرت، ئاخر چۆن سەرهەڵنەگرم ؟ پاش چی ؟ دەرکرام ، تێهەڵدرام ، ئێستاش نەدەهاتمەوە ئەگەر خەونە ناخۆشەکەم نەدیتبایە ، خەونێکی گەلێ ناخوشم بە باوکمەوە دیت : باوکم لە گیانەڵادا بوو ، بۆیە تا زووتر بگەمە لای هەر درەنگە • هیچیشم نەماوە ، چەند مەترێك ، ڕووبەڕووی ڕاستی دەبمەوە• خەونەکە ڕاست بێ یا درۆ بێ ، ئەوا هاتمەوە • خەون ڕاست نییە ئا ، کۆمەڵە ئارەزووەکی جێبەجێنەکراوە • با چیتریش لە سەری کۆڵان نەوەستم • ناشیرینە ! یەکێ بمبینێ چیم پێ دەڵێ ؟ دزە ••• پیاوخراپە • نامناسنەوە •• هەر لەبیریشیان نەماوم ، دە ساڵ کەم نییە • بەم سەرقژنیو ڕیشدرێژیو سمێڵەوە ، چۆن بمناسنەوە ؟ کە ڕویشتم هێشتا ڕیشو سمێڵم نەهاتبوو • تەمەنم پازدە ساڵ بوو ، دەشدەکاتە بیستوپێنج ساڵ • شەویشە ، مرۆڤ بە شەو سیمای دەگۆڕێ ، ناناسرێتەوە • قسەشم لەگەڵ بکەن ، بیاندوێنم ، دەنگم ناناسنەوە ، دەنگم گن بووە • زیادە گۆشتەکەی ناو لووتیشم بڕی هەر چاك نەبوومەوە • با هەنگاو بنێم یا بگەڕێمەوەو ئێرە جێبهێڵم • نا ، ناگەڕێمەوە • ئەدی بۆ هاتوومەتەوە • هەندێ تین ، ورەم بەرزدەبێتەوە ، لە چی بترسم ؟ مەسەلەکە کۆنە ، تەنیا بیرەوەرییەو تۆزی لەسەر نیشتووە ، یادێکی

تاڵەو دووبارە نابێتەوە • خۆ جارێکی‌دی لەشم ناغارێ ؟ لەناو خوێن ناگەوزێنرێم • ساردیش بۆتەوە ، کێ ناڵێ پاش تێهەڵدانەکە پەشیمان نەبۆتەوە ؟ پەشیمانی‌و نائومێدی گەرای لە ناخ دانەناوە ؟ وەزانم تووشی نەخۆشی‌یەکەش هاتۆتەوە ، ئا تەنگەنەفەسی • کە تووڕە دەبوو ، بۆ نەخۆشخانە کاروان‌سەرا بووین • تەنیا بە دەرزی‌یە نووك‌تیژەکەو حەبە سپی‌یەکان هێمن دەبۆوە • هەموو ساتێکیش پەلی شووشە نایلۆنەکە لە باخەڵی بوو • لەوەتی بەبیرم‌دێ هەر وام‌دیوە • تووڕەو توندو تیژ ، تەنگەنەفەسی ، شەونخونی نەخۆشخانە ، تەنیا دواجار کە پێم‌هەڵشاخا ئاگام‌لێ‌بڕا جێم‌هێشت •

بۆ لێی‌دام ؟ بۆ بە پاڵەپەستۆ فڕێی‌دامە دەری ؟ ئەوەی من کردم هێندەی نەدەهێنا تەنیا مەسەلەی دایکم بەبیرهێنایەوە ، خۆ ئەگەر خۆم نەگرتبایەوە ملم دەشکا • ددانم شوێنەواری لە دەمم نەدەما • دەم‌وچاوم هەمووی داماڵابوو • هیچم پێ نەکرا ، باوکم بوو ، کە گوتت باوك هەمووشتێ دەبڕێتەوە • کاشکا باوکێکی دڵ‌نەرم‌و بەبەزەییم هەبوایە ؟! لەبیرم ناچێتەوە ئێوارەیەك چۆنی کوتامەوە ؟ پاشانیش لە ژوورێکی تاریك‌و چۆڵ بەندی‌کردم • چوار سەعات ، نەء بڵێ چوار هەزار سەعات • چ‌ئێوارەیەکی پڕمەترسی بوو ، لەیادم ناچێتەوە • گریان‌و بوورانەوەو پاڕانەوە دادی نەدام • هەر خوا دەزانێ چۆنم بەسەربرد • چەم دیت‌و چیم بیست ؟ ! ! پاڕانەوەی دایکیشم پارەی نەکرد • ئەوسا هێشتا دایکم لامان‌بوو • ئامینەی باوەژنیشم تازە بۆ باوکم گوێزرابۆوە • بەڵام هێندەی پێ نەچوو بووە هەرا ، دایکم دەربەدەر کرا • لەوساوەش دایکم • ... چەند ساڵێ لەمەوبەر گوێم‌لێ‌بوو گوایە لە شارێکی لای سنوور ، شووی بە کابرایەکی ئەوێ کردووەو چەند مناڵێکیشی لێی

هەیە • یانێ برای تریشم هەن ، نەمدیون ، نایانناسم ، ئاخۆ تەمەنیان چەند بێ ؟ چۆنن ، ڕۆحسووکن ؟ خۆزگەم دەتانم دیت ئێوەو دایکم پێکەوە ؟ ! مخابن بۆت دایە !! ئافرەتێکی نموونەیی بووی ، خزمو بێگانەش سوێندیان بە سەرت دەخوارد !!! وەنەبێ نەهاتبمە سۆراغ کردنتو بەدوات نەگەڕابم ، هاتم • بە پرسیاریش ماڵەکەتانم دۆزییەوە • بەڵام لەوێ نەبوون ، گوتیان چوونەتە سەفەر • چەند ڕۆژیش چاوەڕێی گەڕانەوەتان بووم نەگەڕانەوە • ئێ چیبکەم ؟ نامەیەکم بۆت جێهێشت • ئەوە وەڵامەکەت لە گیرفانمە • ئەگەر ئێستا لە ژۆورێك بووامە دەرمدەهێنا• دەمخوێندەوە• وەك چۆن لەوکاتەوە کە پێم گەیشتووە هەزار کەڕەت خوێندوومەتەوە • ئای ئەگەر دەتزانی چەند شەیدای لەباوەش گرتنێکی ترتم !! کوانێ لای لایەو گۆرانیو دەست بەسەردا هێنانەکانت ! ؟ کوانێ دڵدانەوەو هەزارەها شتی ترت • بیست ساڵە لە یەك دابڕاوین • بیست ساڵیشە بۆمان دەسووتێیو بۆت دەسووتێم • دەردەسەرییو کوێرەوەریشت لەولا • ئاخۆ چۆن شێوەیەکت لە دڵتا بۆمان هەڵکەندووە ؟ ! بشێ یەکتر ببینین یەکتر بناسینەوە ؟ لەوانەیە من نەتناسمەوە ، بەڵام تۆ ئا •

دایك منداڵی خۆی دەناسێتەوە • ئەگەر تەنیا جارێك لە باوەشی گرتبێ • تەنیا یەكجار ماچیکردبێ • لە باوەشیشی نەگرتبێو ماچیشی نەکردبێ هەر دەیناسێتەوە • تۆش دەمانناسیتەوە • ئەی چۆن نامانناسیتەوە ؟ بەڵام نازانم خوشكو براکانم دەتناسنەوە یا نە؟ چونکە کە لێمان دابڕای ئەوان تەمەنیان دوو ساڵ بە دوو و نیو بوو • لە دەرگا دەدەم •• دەچمە ژوورێ • بۆ نەچمە ژوورێ ؟ خۆ من شارەزای هەموو کەلێنو قوژبنی ژوورو حەوشەکەم • لەوێ گەورە بوویم ، ترشیو تاڵیو

گریان‌و پێکەنینم تێکەڵ بە گیان‌و دڵ‌و دەروون بووە • ئەگەرچی کەمیش پێکەنیوم • بەڵام لەوانەیە خەوتبن ، بۆ هەڵیانبستێنم ؟ خەو خۆشە ، لەخەوهەستن دەترسن • نا نا هەڵیان‌ناسێنم ، با بخەون • حەوشەکەش تاریکە • وا باشترە بەهێواشی بەسەر دیوارەکەوە ئاوای ئەودیو بم • بە قەڵەمبازێ خۆم لەکن بەلووعەکە دەبینمەوە • دیوارەکە نزمە • بە هێواشی ، ناکەمە تەپەتەپ ، بەڵام چی‌بکەم گەر هەستان • ناشمناسنەوە، چوزانن منم ؟ زراویان دەڕژێ • بە دزم تێ‌دەگەن• دەکەنە هاوار هاوار• حەقی خۆشیانە ، بە هەموویان شالاوم بۆ بێنن ، بمکوژن • ئەوسا جارێکی‌دیش دەکوترێمەوە تا دەمناسنەوە • هەر خوا بزانێ چەندم تێ‌هەڵدەدەن • لە دەرگا بدەم باشترە خۆ دەرم‌ناکەن گەر نەمناسنەوە • دەڵێم میوانم ، هەوەڵ‌جار خۆمیان لێ ئاشکرا ناکەم • تا باش سەرەنجم دەدەن • ئەوسا دەمناسنەوە ، لە باوەشم دەگرن • من ئەوان دەناسمەوە • منیش لە باوەشیان دەگرم • ماچیان دەکەم • ماچم‌دەکەن • ئەوەی ڕابورد ڕابورد • خەتای منیشی تێدابوو • برینی باوکم کولاندەوە • نەدەبوایە باسی دایکم بۆ باوکم بکەم • کورە ئاخر نەشمدەتوانی •

ئەوەتانێ گلۆپی ژوورەکان دەسوتێن • نەخەوتوون ، هەموویان باش دەبینم ، لێم دیارن ، کەل‌وپەلی ژوورێش بە جوانی دەبینم • تەنیا مێزە کۆنەکەش هی ئەوسایە ، بەڵام دەفتەرو کتێبەکانی منی لەسەر نەماوە • پەرداخ‌و پیاڵەو شووشەو حەبی لەسەر ڕیزکراوەو وا لەبەر تیشکی پەردەی تەلەفزیۆنەکە دەبریقێتەوە • باوکم بە چاکی لێ دیارە• بە هەمان شێوەی جاران هەنیشکی داوەتە بالیفێك • تەبیعەتێکی سەیری هەیە ، ئەگەر ئەوها ڕانەکشێ ناحەوێتەوە • ئەوەتان شووشەی دەرمان‌و حەبەکانیشی لەسەر سەریەوەن لەسەر مێزەکە • شووشەیەکی بچووك

به چاکی دەبینم ، له بەردەمیەتی • دیارە تازە حەبێکی قووتداوە • نازداری خوشکم وا لەلای دەستەچەپی باوکم خەریکی نووسینە ، کتێبێکی لەبەردەمە ، جارناجارێ قەلەمەکەی دەخاتە دەمی‌وبیردەکاتەوە • خووەکەی جارانی هەر ماوە • قەلەم‌و دەم‌و بیرکردنەوە • بەوە نەبا نەمدەناسی‌یەوە • ماشەلاّ گەورە بووە • بە بەژن‌و بالاّ هەستاوە • لە نازداریش سەرەوەتر سەرداری برام هەلّترووشکاوە • پشتی لە تەلەفزیۆنە • تەنیا دەستی بەرزو نوێ دەکاتەوە • ملی شۆڕکردۆتەوە • ئەوە ئاوڕی لە باوکم دایەوە • شتێکی پێ گوت • نیومەتر لە سەردار هەورازتر عەلاگەکەی جل‌وبەرەگەکانە • کۆمەلّە شەلّوارێك سەرەنج ڕادەکێشن • لچکی چاکەتێك لەژێریانەوە شۆڕبۆتەوە ، لە چاکەتە شرە کۆنەکەی من دەکا ، بەلاّم ئەو نی‌یە • هەی‌هوو ، پاش دە سالّ چۆن چاکەت دەمێنێ • خۆزگەم ئەوشەوەی ئاوارەبووم لەبەرم بوایە ؟ چۆن سەرمایەك بوو ، تەنیا کراسێك پێ‌ڕانەگەیشتم لەبەری کەم • نیوەشەوێکی تاریك‌و سەرمایەکی بێ‌ئامان بوو ، خوێنی دەمەیاند • لەبەر ژانی قەبرغەشم نەمدەتوانی هەنگاو بنێم ••• دەنگی هاوار هاواریشم دەگەیشتە هەندەران • ئێستاش لە بەرچاومە چۆن خۆم لەناو قوڕو چلّپاوی بەر دەرگاکەمان گەوزاند • ماوەی شەش سەعاتی ڕەبەقیش لەژێر تیشکی گلۆپی بەردەمی مالّی حاجی ئەحمەد لەسەرما هەلّلەرزیم • دنیایەکی کش‌ومات ، شەقامەکەی بەرانبەریش ئاوت تێ‌وەرکردبا • خۆزگەم بۆ کونجێك ، ئاگرو ڕایەخ‌و نوێنم نەدەویست ، تەنیا چوار دیوارم بەس‌بوو • خۆم وێك‌دەهێنایەوە ، تابەیانی هات‌وچۆم دەکرد • چەند جار ویستم لە دەرگای مالّی حاجی ئەحمەد بدەم ، بەلاّم پەشیمان بوومەوە کە دیتم لەوێ نین • لە کونی دەرگاکە ڕوانیمە ژوورێ ، ژوورێکی تاریك‌و چۆلّ •••

دیسمان لە دەرگای ماڵی خۆمانم دا، توند••• توندتر•• پاڕامەوە••
بێسوود بوو ، تا دەنگم گوێی بێدەنگی تاریکەشەوو خامۆشیی
کۆلانەکەی هەلدڕی • ئەوجا بە دڵێکی نائومێد ڕێگایەکی نادیارم
گرتەبەرو بەرەو جیهانی سووتانو دووریو لەیەکدابڕانێکی دە ساڵی
کەوتمەڕێ •

هەولێر

١٨ - ٤ - ١٩٨٣

---

## دیوانی مستەفا بەگی کوردی

ساڵەهایە بە کۆکردنەوەو لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی شیعرەکانی
مستەفا بەگی کوردییەوە خەریکمو ، لەم کارەدا کەڵکم، جگە لە چاپەکانی
دیوانەکەی ، لە پتر لە سەد دەسنووسیش وەرگرتووەو ، لەبارەی ژیانی
خۆیو بۆنەی دانانی شیعرەکانیشیەوە زانیارییەکی زۆرم دەستخستووە•
لیژنەی ئەدەبو کەلەپووری سەر بە دەستەی کوردی کۆڕی زانیاری
عێراقیش ، کە خۆیشم تیایدا ئەندامم بەدرێژاییی دوو ساڵ بەمکارەمدا
چووەتەوە • ئەم کتێبە بەمنزیکانە لەلایەن دەستەی ناوبراوەوە لە چاپخانەی
کۆڕدا ئەخرێتە ژێر چاپو هیوام وایە زۆری پێنەچی چاوو دڵی
خوێندەوارانی کوردی پێ ڕوون ببێتەوە •

**محەمەد مستەفا (حەمە بۆر)**

---

# پەنجەرك

عبدالرحمن مزوری

ئــــەز ڤەدکـــەم
ڤێ پەنجەرکا پاشەرۆژێ ،
ڤەدکـــەم
چ دبینم ..؟!
عـــــەورا لئەسمانێ وەلاتی ..
رەش‌چادرێد خو وەرپێچان ،
چون و قەشیان
ل شوینـــا وان
گەشەستێرا خـــو کێشایێ
قول قول دادایێو ..
ڤەوەشیان
من گولێیە وێ دسترن :
هوین قەت نەشێن
ئەڤی ئەسمانێ هوی زەلال ،
شێل و بێل کـــەن
ئو یێد بەری هـــەوە نەشیان

ئــەز دبینم
بەفرێ قەیدێد رێـکا شکاندن
بەژنێد بەتەنوکا بەردان
خو ڤەددزی ،
مینـــا ریڤی
دبن شاپەرێد وێڤە دبینم
چاڤێـــد بشکوژ و سولینا ..
چـــەوا دزیڤن
تژی هیڤی
ئەز دبینم
ئەڤ هشکەڕۆیێ هوی زوها
هنـــدە سالا ،
مایە زەرباف(١) و بێ بها
ئاڤێ ڤینا خو هاڤیتێ
هەمی کولێد وی ساخکرن
کەلشت و تیکێد ژینا وی ،
تەڤ گرتن و ..
پڕ ئاخکرن
ئاڤا وی هاتو .. هەر رابو
داســەر لێڤا و کنـــارا
لتەنشتا خو رەز و هیڤی ،
گەش کرنەڤە
کرنەف وارگەهێد بهارا
ئــەز دبینم

کاروانیێد رێکا روناهیێ و تاڤێ
زوێ رێــکا بسەهم و درێژ
پەیت ڤەگەڕیانو ••
ئەڤــــەنە
بارێد خو هاڤیتن ، دانان
چتوڤ بارن ••؟!
هەمی جوهاڵێد خوماڵیو
تازەنە
وینشتنە خوارێ ،
وەك مێران
بو گۆندی‌یا
چیروکێد چون و هاتنا خو ،
ڤەدگێڕان
پاشی جوهاڵ وان ڤەکرن
خویادکـــــەم
تژی مزگینی و مژدەنە
ئـــەز دبینم
مێواتری
تو دابێژی ،
سەرێ سەد ساڵانە مری
ئەڤرو شاکێد خو هاڤێتن
رەهێد خو شوڕکرن ،
رێتن
کـەتە بێسیرەی و فری

هلدا ژ دل ،
ئەو بەرپەڕێ تاریو تەحل
بەسکر گری
ئـــەز دبینم
ئەڤ چیاکێ هەڕۆ جلکێد وی دسۆتن
دکرنە رەژی •• دکرنە تەنی
وێهـــە تێتن
چاکێ شویشتیو ڤەشویشتییە
خـــەملا خو وی ،
جارەکـــا دی
ژبنێ پیـــا حەتا سەری
کەسك کرییە
وێهەتێتن
تو باش بنێرێ ئەزبەنی
چ سەربلندە دکەت کـەنی
ئـەز دبینم
لهنداڤ سەرێ من چار پەری
چەرخا ددەن و دزڤڕن
جار ئێکودو هەمبێزدکەن ،(٢)
جـــار دفڕن
کارێ وان لەیزو دیلانەو
ماچیکرن
هو دبینم

هەرچار پەری راست بونە ئێک
هـــەر بلندبو •• بلند فڕی
وێ شاپەڕێد خو ڤەکرن
گول ژێ بارین
تەڤ گولێد خو ،
بهەرچار قولاچا وەرکرن
تەڤ گولێد خو ،
بهەرچـــار
قولاچـــا
وەرکرن

---

(١) زەرباف = باڤزەر ، رەنگێ زەر
(٢) هەمبێزدەکەن = یەکتر لە باوەش ئەگرن •

# خـەياڵو هەڵوێسـتە

جمـال محمـد اسـماعيل

ئێوارەیە ..
خۆم بە خەیاڵ سپاردووە ..
کەوتوومەتە ناو جۆلانەی ئەفسانەوە
بە ئارەزووی هەنگاوی تۆ ..
دەمباتو دەمهێنێتەوە ..
چەند خۆشـــە لام
کاتێ شەرابی چاوەکەت دەخۆمەوە
ئەگریجە تاڵ تاڵەکانت
وەك پاسەوانی کۆشکی شا
بەرەوڕووم دێن
هەناسەی دەروونم دەگرن
ڕێگای هاتوچوونم دەبڕن
جواناوی ئەشقی خودایيم
دەشۆنەوە !!

★ ★ ★

ئێوارەیە چیا زەردەی کردۆتە کۆڵ
دەیبا بۆ شاری غەریبان !!

وا من چاوی ڕەشی جوانت
دەکەم بە تازە وولاتێ
خەمی زینی ئەم دنیایەی تیا دەنێژم
نەخشەی زیندە بەچاڵ پوونی
ئەفسانەی تێدا دەڕێژم
ئەی شاپەری ...؟
من چاوی تۆ
بۆیە بە وولات دەناسم
چونکە لەناو باوەشیا تۆی ڕاژاندووە
لەناو جۆلانەی چیادا
سەرخەوی شیرین‌و نەرمت تەراندووە
هەچەند نامەوێ لای خەڵکی
نهێنیی خۆشەویستیی تۆ
بدرکێنم
بەڵام چی‌بکەم نە تۆ ئەوەی
گەورەیی نهێنی بزانی
نە تۆ ئەوەی یاری ئەو خەمە بتوانی
نە من لەناو ئەو گێژە پڕجەنجاڵەدا
ئەوەم بڵێم هەندێ ووشەی
وەك کچی جوان ئەتۆرێنم

★ ★ ★

ئێوارەیە ...
شـــەو خەریکە
فلیمی گێژەنی چاوت دەخاتەکار
ئێوارەیە مێگەلی خەیاڵ‌و تاسەم

بەرەو سەرکانیی ئازارم
شۆڕدەبنەوە
دەم گیردەکەن لە دەمارم
وەك تینوو و هار ..!!
بۆ شمشاڵی شوانی هەوار سووتاو دەگرین
بۆ ڕەشماڵی هەڵپێچراوی
بیری دوورە بەهار دەگرین
وەك من چۆن بۆ ماچێکی تۆ
هەرچی رۆژنامەو گۆڤارە ئەیخەمەڕێ
چی بارانی دوا نەورۆزی نۆبەهارە
لــە دەریاچەی چاوەکانت
دەیبارێنم تا بەربگرێ

* * *

ئەی ڕوو لە تریفە ناسکتر
ئەی ڕوو لــە شەوی ژوانێ
بەئاکامتر ..!!
تۆ بۆ من بووی بە ئاسمان
بووی بە خۆر
من بووم بە زەوی
نە دەستم دەگاتە تۆ
کەچی بە چرپەیەك
کەزیەت تێمدەئاڵێ
دەمسووتێنێ ...، دەمگرینێ
دەمــکا بە سۆ

بۆیە بووم بە شمشاڵی شوان
نیوە شـــەوێ
دوای چەند کاروانی خەیاڵی
دەم سەرخەوێ ..
دەست پێدەکەم
ئەوەی دەیڵێم نایڵێمەوە
دەست پێدەکەم
وەك مۆمی سەر گۆڕی شەهید
دەتوێمـــەوە
دەست پێدەکەم
وەك ئازاری دڵی دیلێ
بە نەشتەرێ دەکولێمەوە
چۆن ئاشقێ شیعر دەکا بە نوێژی خۆر
ئاوا منیش بۆ تۆ دەژیم
شەو چۆن بێتریفەی ئەستێرە
خـــەم دادەگرێ
منیش بۆ تۆ ئاوا دەگریم
دەریا باڵی ناجووڵێنێ
تا کەشتییەك لەنگەر نەگرێ
زەوی بێ شەونمی باران ناژێتەوە
گوڵێ لەڕێی ئەشقا وەری
ئەژی ... ئەژی تا دنیا بێ
تاکو خۆر هەڵێو ئاوا بێ
زیندووە هەرگیز نامرێ

★ ★ ★

خۆشم دەوێی
بۆیە بە هەر ئامرازێکی مۆزیقایە
پێت هەڵدەڵێم
بە زمانی چی باڵندەی ئەم دنیایە
بۆ تۆ دەدوێم
لــــە مــــن ڕوونە
تۆش لەناو خۆتا بەشێکی گیانی منی
لــــە من ڕوونە
تۆش لــــە چرپەو هاتوچۆتا
ماسی‌یەکی کەنار دەریای بیری ونی
بۆت دەگەڕێم
گەر سەرم داناوە لەڕێت
ئەتدۆزمەوە
سەرچاوەی دەریاکان دەگرم
وەك ڕاوچی نێچیر ئەنگاوتە
دەتقۆزمەوە
یاخی دەبم
تا چاوت دەکەم بە بەرماڵ
دەستنوێژی زیندەخەوی
بەربەیانمی لەسەر دەگرم
بۆ چاوبرکێ‌یەکی ژوان
سەنگەر دەگرم
یا پێی شاد دەبم یا ڕێگای
هومێدێکی مەزنتری بۆ دەگرم

١٩٨١

# بەرەو کوێستانەکەی گەردین

عەلی مەحموود جووکل

لەوبەری مزگەوتەکە لەژێر داربی‌یەکانی دەمجۆگەکەی شەقامەکە ترومبێلەکەی ڕاگرت • کلاّوو جـەمەدانی‌یەکەم بەدەستەوە گـرت • بەدەستەکەی دیم دەرگای ترومبێلەکەم کردەوەو دابەزیم • چاوێـکم بـە بازاڕو دووکانەکاندا گێڕا ، زۆربەیان داخرابوون • شەقامەکە لـە هاتووچۆکەران چۆڵ بوو ، تەنها چەندکەسێك نەبێت کە دوور لـەم یەکتری ڕاوەستابوون ، لەوبەری پردە ئاسنینەکە ، لەنزیك چیلـەو پاردەکە کۆمەڵێك کە تێك‌قژقژابوون دیاربوون •

ئەم ناوە بەسام بوو ، برووسکەی ترسێك لە مێشکم چەخماخەی دا ، بۆیە داهاتمەوەو پاژنەی کلاّشەکانم هەڵکێشا ، بێ‌ئەوەی کـلاّوو جەمەدانی‌یەکەم لەسەر بنێمەوە ، بەهەشتاوی خۆم بە کۆڵانە تەنگەکـەی تەنیشت مزگەوتەکەدا کرد • لـە سیلەکە پێچێکم بۆ کردەوەو بەسەر هەورازەکە کەوتم • گۆڕستانەکەی سـەر باسکەکەی دێم بەدی‌کرد ، خەڵکێکی زۆر لەلای دامێنی کۆبووبوونەوە ، دیاربوو خەریـکی ناشـتنی تەرمێك بوون •

ناسیاوێك لـەناو چۆمەکـەڕا بەرەو ڕووم دەهات‌و بەسـەر هەورازەکە دەکەوت • کاتێ بەیەك گەیشتین ، چاك‌وچۆنی‌یەکی گەرمان لێك‌کردو لێم‌پرسی :ـ

ــ ئەوە تەرمی کێیە دەینێژن ؟

ــ تەرمی مێرێیە • ئەی دراوسێ نەبوون ؟

ــ کەی ئەمری خوای بەجێ گەیاند ؟

ــ پاش نوێژی شێوان ، خۆی و چێلەکەی بوون بـە قۆچی قوربانی تخووب بەزاندن !

لێك دابڕاین • بەڕاستی خەبەرێـــکی جەرگ بڕ بوو • فرمیسك لەچاومدا قەتیس ما • لەتووڕەیی یان مووەکانی لەشم وەك نەشتەر لــــە لەشم ڕادەچوونەوە •

شۆڕبوومەوە • ســـەرەو هــەوراز بوومەوە • ڕێگاکە بەلای سەرەوەی گۆڕستانەکەدا دەڕۆیشت • سەیرێکی گۆڕەکانم کرد کـــە تەنیا کێلەکانیان بەپێوە مابوون • گڵی سەرگۆڕەکان سوواببوونەوە • گەر بە کێلەکاندا نەبایە لە زەویی چواردەوریان جیـــاواز نەدەکرانەوە • گۆڕەکانم یەك یەك دەناسی یەوە • دەمزانی خەڵکی کام شـارو کـــام گوندن •

لە دڵی خۆمدا گوتم :ــ

ــ ئەوە تەرمی پلکە مێرێشیان بەخۆوە گرت •

ســـەری ڕێزم بۆ دانەواندن • ویستم بـگریم ، بەڵام گریان لە قوڕگمدا خنکا •

لەبەرخۆمەوە گوتم :

ــ پیویست بە گریان ناکات ، چونکە ژیلەمۆی ئاواتەکانیان ســـەری هەڵدایەتەوە • چراوگی مەشخەل لەگڕدایە •

چەند هەنگاوێکی‌دیم نا ، دیتم یەك دووانێك لەســـەر چینچکان دانیشتوونو پشتیان بە دارتووەکە داوەو بەدەم قسەکردنەوە چیلکە لـــە خۆلەپۆك وەردەدەن • سلاوێکم لێ کردنو بەرێی خۆمـــدا ڕۆیشتم • ئاوابووم ، ڕێگەکەی پشت خانووەکەی شێخم گرتەبەر ، لەوســـەری سیلەکەوە سووڕامەوەو بە کۆلانە بەرینەکەدا ڕۆیشتم •

بەقوولایی یادەکانی ناخمدا چوومەوە ، بەرەبەرە ئادگاری پلـــکە مێرێم هاتەوە پێش چاو ، کـــە پیرەژنێکی سپیلکە بوو ، سوورایی لـــە ڕوومەتیدا نەمابوو ، لەبـــەر ئەشکەنجەو ناسۆری ژیان دەموچـــاوی چرچولۆچی کەوتبوونێ • خۆ داوە موویەکی ڕەشت لـــە بسکەکانیـــدا نەدەدیتەوە ، دەتگوت کلۆی بەفرەو زریان زەردباوی کردووە •

بەدیمەن پیر بوو ، بەلام هێشتا بەکارە بوو ، لەســـەر شینگ‌و تاقەتی خۆی مابوو ، چـــەند بلێی چاپوك‌و ئازا بوو لـــە ئیش‌کردن نەدەترسا • شەوو ڕۆژ نەدەحەسایەوە ، لە چلەی زستاندا دەچووە ناو لیرو پاوەنەکەی بەر گوندی کۆلکەداری دەهێنان ، یاخود لـە بەهـاردا خەریکی بن‌کۆل‌کردنی شەتل‌و بژارکردن دەبوو • بۆ هـــەر ئیشێك بچووبا چاپووکانە دەستبەکاری دەبوو ، چی‌لە باوەرین هەلگرتنەوەو ، گوێزخڕکردنـەوەو ، سێـــوو کرۆسك هەلـــگرتنەوە ، نان‌کردن‌و چێل‌دۆشین‌و ئیش‌وکاری ناومال هـــەر مەلێ • هەر کارێك مـــایەی خۆشی‌و گوزەرانیان با ، بەچاکی ڕای‌دەپەڕاند • بەڕاستی ژنێکی بەکارە بوو ، بووکەکەی بەتەواوی پێوە حەسابووەوە •

کاتی لـــە گوند بووین ، ژوورەکەمان لەگـــەل مالەکـــەیان دیوارێکیان بەین‌بوو • پێش‌بانێکمان هەبوو دەیڕوانی‌یە دەردێیەکـە ،

هاوینان دەکرایە شینایی‌و چواردەوریشی بـــە تانوك چنرابوو ، پشت دەرەدێ‌یەکە هەتا چـــاو بڕی‌کردبا هـــەر ڕەزو باخ بوو •

دالآنەکەیان دوو دەرگای هەبوو • دەرگایەکیان کەوتبووە ســـەر پێش‌بانەکەمان ، جـــا پلکە مێرێ زووزوو سەری‌لێ‌دەدایین‌و هـــەر پێویستی‌یەکمان هەبا ، خوا هەڵناگرێ زوو بۆی جێ‌بەجێ دەکردین • زۆرجاران لامـــان دادەنیشت‌و قسەی خۆشی بۆ دەکردین ، هـــەر باسێکیش هاتبایەگۆڕی ، دەستبەجێ پەندێك یان مەسەلەیەکی لەســـەر دەهێناوە ، بەلآم لە هەمووان زیاتر کە بەدڵم بووبێت ، ئەوەبوو جارێکیان چیرۆکـێکی بۆ گـێڕاینەوە کە چەندەها جار گـێڕاومەتەوە •

ئەمیش ئەوەبوو ، جارێکیان باس هـــاتە سەرئەوە کە خێو هەیەو دەست دەوەشێنێ ، ئەویش هەڵی‌دایێ‌و گوتی :

ــ با چیرۆکێکتان لەسەر خێوان بۆ بگێڕمەوە •

منیش وەك منداڵە تامەزرۆیەکان گوتم :ــ

ــ دەی چاوەکەم دە بۆمان بگێڕەوە •

گوتی : وادەگێڕنەوە :ــ

«سەرەتای مانگی جۆزەردان بوو ، خێوەکان لە شەوانی تاریك‌و نووتەکدا ، شالآویان بۆ گوند دەهێنا ، گەرایان دەنایەوە • دیارە ئەمەش گەر پیاوی چاك‌و خێرخواز هەبێت ، بۆیان ناچێتەسەر ، بۆیە هـــەر لـــەو شەوانەدا دەستیان‌کرد بە دەست‌وەشاندن‌و فڕاندنی خێرخوازەکـــان‌و شوون بزریان دەکردن •

دەیانگوت لە شوێنە نەزانراوەکانیاندا ، چاوەکانیـــان هەڵدەکـۆڵن‌و پەردەی گوێ‌یەکانیان دەتەقێنن‌و زمانەکانیان داخ‌دەکەن ، دەیان‌دەنە بەر

ئاو بۆئەوەی ڕەنگە گەنمی‌یەکانیـــان ڕەش داهـەلگەڕێن ، وایان لێ دەکردن کـــە ئادگارەکانیان بە ئێمەمانان نەچێتەوە •

بەڵایەکی گەورە بوو بەســـەر ئەم خەڵکەدا هاتبوو • خەڵـــکی کلۆڵو بەستەزمان دەستیان بەسەریاندا نەدەشکا ، جا چی چاكو پیر نەما هانای بۆ نەبەن ، ڕۆژ نەبوو دەست بە دوعاو نزا نەبن ، وایان لێ هاتبوو کەحەزیان نەدەکرد قەت شەویان لێ دابێت ، چەندەها قوربانی‌یان بۆ چاکی تاوکێو چاکی مزگەوتێ کرد ، بەڵام هیچ دادی نەدا •

ڕۆژبەڕۆژ خێوەکان لە پەرەسەندندا بوون ، ئەم ناوەیان هـــەموو تەنیبوو • دارو دەستەشیان بۆ خۆ پەیدا کردبوو ، کـــەس نەی‌دەوێرا بلێ «لەل» ، خۆ بە پیاوەکانیشەوە ڕانەدەوەستان ، بەڵکو پڕیان‌دەدایـە ژنو منداڵیش ، خەڵکەکە بەجارێ هەراسان بووبوون •

تا ڕۆژێکیان مامڕەسوو ناوێك کە پیرێکی ڕیش‌سپی‌و کەنەفت بوو ، دەیان‌گوت ددانی خەرێفی‌ی هاتبووەوە ، خەڵـــکەکەی لـــە ڕۆژێکی چوارشەممەدا کۆکردەوەو گوتی :ــ

« لە دێرزەمانەوە ، باوباپیرانمان گێڕاویانەتەوە ، ئەگـــەر هاتوو خێوەکان هاتنە سەروکارتانەوەو لـــە گیانتان بەربوونو بیانەوێ بتانکەن بـــە کۆیلەو بەندەی خۆیان ، زەوی‌یەکانیشتان لێ داگیر بکەنو گەرای تێـــدا بنێنەوە ، کوڕە نەکەن دەستەوەستان بن ، هـــەیپەی لێ‌بکەنو شاخەوانەکانتان دەنگ‌بدەن ، کام شاخ لە هەمووان بەرزترەو لـــە هەمووان سەختو دژوارترە ، ئەو شوێنەی کە بەیانیان پێش هـــەموو جێ‌یەك تیشکی ڕۆژی لێ دەدات ، ئا ــ با بچن لەوێ بەردو گڵە تیشك بەرکەوتووەکە بهێننو بیدەنە دەست کچو دایکان ، تا بە دەستاڕ بیهاڕنو

بیکەن بە کل ، بەمەرجێ دەستاڕ هاڕین شەووڕۆژ نەپسێتەوەو لە گەڕ نەکەوێت •

جا کلەکە بدەنە دەست گەنجە بزێوو چاونەترسەکان ، لە تاریکی شەودا ژێرانە بیڕژێننە دەموچاوی خێوەکان ، هەر خێوێك پرووشکێکی کل بە چاوی بکەوێت ، دەستبەجێ لە شوێنی خۆی دەتاوێتەوە ، هەتا لە دەوروبەری خۆتان قڕیان نەکەن ، نەکەن وازیان لێ بهێنن ، چونکە سەر هەڵدەدەنەوە •

براینە ! ئەوەی لەسەرم بوو پێم گوتن ، جا خۆو شێرتان ، ئەوەش چاك بزانن کە خێرو خۆشی هەر لەسەر دەستی ئەوانە » •

لەناو خەڵکەکە غەڵبەغەڵب پەیدابوو ، یەکێ هەڵیدایێو گوتی :

— ئەم کارەی تۆ ئەیڵێی ، کارێکی سەختو دژوارە ، پشوو درێژیی دەوێ •

یەکێکی پۆشتەش گوتی :—

— جا ئەمەی بۆچییە ! خۆ بۆخۆتان دەزانن ڕووهێنانەکەی بەهاری بار ، بەجارێ ماڵی کاول کردنو ئەوەی هەمانبوو و نەمانبوو لەکیس چوو ، تازە بەو بێدەرامەتی یە ، تینی ئەم کارەمان لەکوێ بوو ؟

قابیلە چییان لێمان دەوێت ! هەرچی یەکیان گوت وادەکەین • مامعەوڵا کابرایەکی کەڵەگەتی چوارشانە بوو ، سەرو ریشی سپی بووبوو ، بەساڵا چووبوو ، بەڵام هەر جارێ بچووبایە ڕاو ، دەتگوت تازە گەنجەو قەتیش بە دەستبەتاڵی نەدەگەڕایەوە ، هەڵیدایێ گوتی :—

ـــ نەخێر ••• نەخێر خۆ ئێمە کەرو گـــا نین بەئارەزووی خۆیان بـارەبـەرمـان کـەن ، چۆن دەبێت هـەرچییەکیان گوت وابکـەین ؟ یاخـود ئـەوەی بیـانـەوێ بـۆیان بچێتـە سـەر دەنگ نـەکـەین ؟ هـەی غیرەتتان سەخوا ، دەزانن لەوەتەی من هەمو چاوم کراوەتەوە ، هەرکەسـێك تخووبی ئێمەی بـەزانـدبێت ، زەبـری دلـێرانی مـەی پێکەوتۆوەو وەك سەگ کلکی لەناو گەلانی خۆی ناوەو بە لوورەلوور ڕای کردووە •

وا پێتان دەڵێم چی لـــە ئێستا زووتر نییە ، خـۆمو خولـــەو حەمەی کوڕم ، ئەو حەمەیەی کـــە دایکی بە ناوی حەمـــەی گۆزێی کردووە ، پشت دەدەینە چیاکانو دەست بەکار دەبین ، یا سەرمان تێـدا دەچێتو یان گڵو بەردەکە دەهێنین ، ئەمەش چاك بزانن هەر بۆخۆشمان بەرەنگاری خێوەکان دەبینەوە •

مامعەوڵڵا قسەکانی تەواوکردو هەر لەم کۆڕەدا خۆیو هـەردوو کوڕەکەی ڕێگای کێوە بەرزەکانیان گرتەبەر ، ئەوانـــە یەکەمکەس بوون ، ڕێگای شاخەکانیان بۆ ئەم مەبەستە دابووە بەرەخۆ •

دارو دەستە ناڕەسەنو قولغە نەگریسەکان ، هەر ئەو شەوە خەبەری خێوەکـــانیان داو مەسەلەکەیان تێگەیاندن ، ئەمانیش درەنـگییان لێ نەکرد ، هەر بەوشەوە کەوتنە گیـــانی خەڵکەو ••• مامڕەسووی پیرو کەنەفتەیان لەسەر زلاك ڕاکێشاو بە زیندوویی چـــاوان لـــە دەرەدێی گوندیدا ئاگریان تێبەردا • خەجێی مـــام عەوڵڵاشیان بـــە خۆیو بووکەوە کرد بە کەنیزەکی خۆیان •

دەڵێن مام عەوڵڵاو کوڕەکانی بووینە کەودەری ، لە چواردەوری

شاخە بەرزەکەی هەڵگۆرد ، هەڵدەفڕنو دەنیشنەوە ، بەیانیان لەوشوێنە هەڵدەنیشنەوە کە پێش هەموو شوێنێک تیشکی ڕۆژی بەردەکەوێت » •

ئەم چیرۆکە لە مێشکمدا خولی دەخوارد ، وا لەگەڵی گونجابووم ، سەرتاپای هەستو هۆشی داگیر کردبووم ، کاتێ هەستم بە خۆ کرد ، گەیشتبوومە بەر کۆزە ئەسپیندارەکەی زارگەلی •

سەرم بەرزکردەوە ، دیتم ڕەوە قەلێك لەسەر بانی سوورە گـەلی هەڵنیشتبوون • جا ئاوڕێکم لە شاخە سەرکەشەکەی هەلگورد دایەوە ، کەودەرییەکانم هاتەوە پێش‌چاو • بزەیەکم هاتێو خۆم خزاندە نـــاو کۆزەکەو ڕێگای کوێستانەکەی گەردینم گرتەبەر •

---

نێرو مێ هەردوو بەجووتە بۆ وەتەن هەوڵێ نەدەن
دوورە دەرچوونی لە دیلی مەل بە باڵێ نافڕێ

بێکەس

---

# تاقگـەی مەنـــد

**نەژاد عەزیز سـورمێ**

«نامەکانتم خوێندەوە ••
پەیام بوون ••
بەڵام شتێك کە لە هیچی ئەم دونیایەی نەدەکردم ،
لەناکاو گۆلە فرمێسکی ڕەنگ‌خواردووی دیدەمی سمی ••
لەوساوە بینایيم کوێربووە ••
لەوساوە نە دەتبینمو نە تێت‌دەگەم •••
ئەمە چڵێکی ئەو ترووسکاییی‌یەیە کە تا دوێنێ بەرپێی خۆمم پێ دەدی

## (١)

دونیـــا شەو بوو ••
کیژۆڵەیێ گۆنای گوڵی سپێدە بوو
کیژۆڵەیێ چاوی گەشی ،
هێشتا ئاشنای تۆزو گەردی غوربەت نەبوو ••
لـــە شەوستانەوە دەهات :
دڵی گەورەی
خەمی گەورەی ، دابووە کۆڵو
بۆ شاری چراخان دەچوو ••

★ ★ ★

دونیـــا شەو بوو
من بێئاودەنگ ، بێمەئوا
شەویش لەبەر گۆنای ئاڵی ئەم کچەدا بێپەنا بوو !
( ڕێگای سەختی غەریبی خۆی گرتووەتەبەر
نازانێ کە لەم دونیایە بێئەنوایە
بێدەنگی دەبێ بە پەنای بێپەنایان .
نازانێ کە ڕێگای سەختی
غەریبی خۆی گرتووەتەبەر ،
دوای سێبەری خۆی کەوتووە ..! )
چســـوود ؟!
چسوود کە شار دەبێ بە دەریای چراخان ؟
چسوود کە کەس ئاگاداری سووتانی دڵی کەس نییە ؟!
چسوود کـــە تۆ ،
لـــە سپییە ڕۆژێکی وادا ،
دوای سێبەری خۆت دەکەوی ؟
چسود ؟ چسوود ؟!

(٢)

من دەمدیتن ..
گوێم لێیان بوو
من دەمدیتن ، لە باڵەخانەی خەسرەودا هەڵدەتووتێن
من دەمدیتن پێکی خەمەکانی فەرهاد دەخۆنەوە ..
( هەزارە زیلەی مێروولەن
بە تەلاّنی شیعرەکانم هەڵدەگەڕێن .. )

من دەمدیتن کە دونیای ڕوونیان لێ کردین
بە شەوی ئەنگوستەچاوو
دەرگای سێبووریان بەستین ••
من دەمدیتن •• گوێم لێیان بوو
لەترسانا :
چـــاوی زەقو
دەستی قامچیو
زمـــانی جوێنو
زاری تف بوون ••
( بە چی چووەو ، بە چی دەچێ ؟
مێژوو لە ڕۆژگاری تاڵو
شەوگاری خۆشەوە بەدەر
چی تیابوو ؟
بە چی چووەو ، بە چی دەچێ ؟ )

★ ★ ★

کیژۆڵەیێ گۆنای گوڵی سپێدە بوو
هەوازدەی ، سەمای نێرگزی کوێستان بوو
بۆ شاری چراخان دەچوو ••
( بە چی دەچێ ؟
شاری چراخان لە گوڵ دەترسێ
شاری چراخان ، خامۆشە خامۆش
چووەتە ژێر باری خەوی دێوەوە ••
پاماڵی کەنیزەکانی حەرەمسەرای سوڵتانە ••
بە چی دەچێ ؟

کەسێ ڕێگای غەریبی خۆی بگرێتەبەر
دوای سێبەری خۆی بکەوێ ؟ )

**(٣)**

مەزلم •• هەوارم ، سێبەری
پەڵـــە هەوری ،
بەهارێکی قات‌و قڕ بوو !!
تاکە پەنای غەریبی‌و غوربەتیم تۆ بووی ••
تۆ مێرگی سەوزی کوێستان بووی
مـــن بێزار بووم
تۆش پەنام بووی ••

ـــ : لەم بەهارەیش قات‌وقڕتر ؟
لەم ڕووخۆشی‌یەش تووڕەتر ؟
لەم هەرایەش کڕوکپ‌تر ؟

( ڕێگای سەختی غەریبی خۆتت گرتووە
تۆ دوای سێبەری خۆت کەوتووی
بۆ ، چی ، دەگری ؟
**ئەم شۆڕەزارە بە فرمێسك ناڕوێتەوە ••**
مێژوو لە ڕۆژگاری تاڵ‌و
شەوگاری خۆشەوە بەدەر ،
چی تیـــابوو ؟
تۆ کـە لەم سپی‌یە ڕۆژەدا
دوای سێبەری ڕەشەوەبووی خۆت کەوتووی

بۆ ،
چی ،
دەگری ؟ )

## ( ٤ )

سەر هەڵئەگرم !
دەڕۆم بەدوای پەنجەرەیێکدا دەگەڕێم •
سەر هەڵئەگرم !
جارێکیتر ناچمەوە ژێر لێفەکەی خەوی منالیم
دەڕۆم بەدوای کولانکەیێکدا دەگەڕێم ••
دەڕۆم •• دەڕۆم •• سەر هەڵئەگرم
ئەم شۆرەزارە بە فرمێسك ناڕوێتەوە •

حوزیرانی ١٩٨٢

---

ئەگەر ئەم کتێبەت نەخوێندووەتەوە بیخوێنەرەوە :

**ئاوڕدانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقــە**

نووسینی : **مستەفاعەسکەری**

بە هاوبەشی کردنی :

**مامۆستا هەمزە عەبدوڵلا**

**د• عیزەدین مستەفا ڕەسوول**

**محمدی مەلاکریم**

---

# كوللـه

نووسینی : زەكەریا تامیر
یاسین بەرزنجەیی
بە دەسكاری‌یەوە وەریگێڕاوە

هەبوو ، نەبوو ••• كەس لە خوا گەورەتر نەبوو ••
زەمانی زووو •• شارێك هەبوو
لەم شارەدا ، هەمووشتێك یەكجار زۆر بوو
هەر لە ڕووبار ، تا ئەگاتە كێڵگەی بەردار
لە سنووری ژمارەكردنا نەبوو
خەڵكی ناوشار ، نەیاندیبوو برسێتی‌و خەم‌و ئازار
هەموو لە ماڵی خۆیانا دانیشتبوون
خەریكی كاری خۆیان بوون
تا ڕێكەوت ڕۆژێ لە ڕۆژان
یەك لە پیاوان
لەوانەی دانیشتووی چیان
ڕەوە كوللەی بەئاسمانەوە بینیبوو
هات ، پێی‌وتن :
ڕەوە كوللەیەكی بەدەر لە ژمارە
كەوتۆتەڕێ ، ئەیەوێ بێ بۆ ئەم شارە

که ئەمەیان بیست خەڵکی شار
سوپاسی زۆری پیاویان کرد
وتیان بەرگری پێویستە لەم بەڵایە
لەم ڕەوە کوللەیەی کەوا لە ژمارەکردن نایە
شاعیرەکان چەندین پارچە شیعریان دانا
باڵی کوللەیان شکاند تیا ••
گۆرانیبێژ •• یەکێ چەند ئاوازیان ڕێکخست
متمانەیان بە هێزی خۆ تیا دەرئەخست ••
کوللەیان پێ ڕسوا ئەکرد
سوپای بەڵای کوللەیان پێ بەربا ئەکرد ••
( پیران ) بە کۆڵە کتێبی کۆنی پەڕە زەردباوەوە
لەو تیووریە ئەگەڕان
کە ترسنۆکیی کوللەی پێ ئیسپات ئەکرێ
خەڵکی ناوشار بەرگی ئەوتۆیان ئەپۆشێ
گوایە ئەوەی لەبەریکا بەری کوللەی پێ ئەگیرێ ••
لەسەر دیوارەکانی شار ئەیاننووسی :
« بمرێ کولله ! »
هەموو بەجارێ ئەیانوت :
کولله ناشیرینه ، پیسه ••
بێدەسەڵاتو نەگریسە ••
پیاوێکی پیر کە بە دانایی ناسرابوو
زۆر بە قەدرو ویقارەوە کەوتە دوایان :
« براینه !
بمانەوێ بەسەر کوللەدا زاڵ بین

سەرەتا ئەبێ بزانین
کوللە بۆچی ئەدا بەسەر ئەم شارەدا ••• »
**لە وەڵاما هەموو وتیان :**
« چونکە خۆمان گوناهبارین
بۆیە ڕەوە کوللەش بۆ سەر ئێمە هاتوون ••
( بـا ) یە بۆ هەرکوێ بیەوێ کوللە دێنێ •••
ئەم کوللانەش هەموو هەر ( بـا ) هەڵـیگرتوون
وتیان •• وتیان •• فرەیان وت ••
تا وای لێهات ••
هێرشی کوللە گەیەجێ ••
**لێشاوی قسەی پڕوپووچ دوایی نەهات ••**
ئەو هێرشە هەتا ئێستاش وەك خۆی ماوە ••
گژوگیا ، میوە ، دەغڵودان ، گەڵای درەخت
گشـت خوراوە ••••
هەموو لە ڕیشە هێنراوە ••
کوللەش هێشتا لە هەرکوێ گیرسابێتەوە ، نەترازاوە ••
ئامادەی هێرشیترە ، بەسەر پشتی باڵی ( بـا ) وە ••

# دەنگت دەگاتـــە گشـت لایێ

عەبدوڵلا کەریم ڕەباتی

دەیانزانی ..
دەست لە ناخی زەوی گیر دەکەی .!
بەری ڕەنجت دەکەی بە گوڵ
هەر خۆر هەڵدێ تا ئێوارە
ڕقە پیرۆزەکەت دەکەی بە دەرزی ناو قوتابخانە
منالآنی شاری گڕی پێ فێر دەکەی ...

★ ★ ★

دەیانزانی ..
ئەگەر شەو بوو تەنیا مۆمێك
چراخانی سەر ڕێـگاتە
لە کرێوەو تۆفانیشدا
تەنها چاکەتە شڕەکەت ، دیوەخانی زستانانتە
گەر ساڵەکەشی نەهات بوو
لەناو بەفرا ملی بژێوی دەردێنیو
مل کەچ ناکەی ...

★ ★ ★

دەیانزانی ••
چونکە تۆ لەو هێمن‌تری
بزماری ڕق بە پەنجەکانتا داکوتن ،
هەرگیز لەو ڕێیە لانادەی
چونکە تۆ عەشقێك شك ئەبەی
لەناو خوێنتا تواوەتەوە •••
چونکە تۆ عەشقێك شك ئەبەی
ڕەگی لە گشت شوێنێك بڵاو بوەتەوە ••
دە تۆش مەبە بەو ئاسکەی
سەرکەش دەبێ‌و نایەتەوە
چونکە تۆ لەو هێمن‌تری
ڕووبارێکی لە چیاوە سەر هەڵـئەدەی‌و
دەگەیتە گشت چۆڵ‌و کرك‌و بیابانێ ••
دنیا هەموو ئەگریتەوە •••

---

من ئەو دیلەم کە دیل‌کەری زۆردارم •
دڵی لەبەر گوڕی ناڵەم ئەلەرزێ ؟
تا شرتر کا کەڵبەی لەشی زامارم ،
خۆی خراپتر لەناو خوێنا ئەگەوزێ !

**گـۆران**

---

## ئەمڕۆو دوێنێی ڕۆژنامەنووسیی کوردی (١)

محمدی مەلا کریم

لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەوانەی خەریکی توێژ هەڵدانەوە لە مێژووی پەیدابوون و گەشەکردنی ڕۆژنامەنووسین لە جیهاندا ، بەڵگەو نیشانەی ئەوەیان بە خەیاڵی خۆیان دۆزیوەتەوە کە ڕۆژنامە لە دێرزەمانەوە لە جیهاندا بووەو نموونەیوا ئەخەنە بەردەست کەوا چەند سەد

---

(١) ئەمە ئەو موحازەرەیەیە کە بەداوای لقی نەقابەی ڕۆژنامەنووسانی عێراق لە ناوچەی ئۆتۆنۆمی لەڕۆژی ١٩٨٣/٣/١٦ دا لە هۆڵی ڕۆشنبیریی جەماوەر لە هەولێر خوێندمەوە •

هەڵی بڵاوکردنەوەی ئەم موحازەرەیە زۆر بۆ ئەوە بە لەبار ئەزانم کەداوای لێبووردن و چاوپۆشی لەو برادەرانە بکەم کە وەڵامی پرسیارەکانیانم نەدایەوەو ، ئەمەوێ متمانەیان بدەمێ کە تاقە هۆی ئەو وەڵامنەدانەوەیە ، بەش بەحاڵی من ، ئەوەبوو پرسیارەکانیان نەخرایە بەردەستم • پاشان کە پرسیارە وەڵام نەدراوەکانم خرایە بەردەست زۆر دڵگران بووم کە وەڵامیان دەسگیر نەبوو ، بەتایبەتی هەندێکیان کە بۆچوونیان لەگەڵ هیی من جیاوازبوو و زۆرم مەبەست بوو وەڵامی ئەوانە بدەمەوە ـ م• م• ك •

بەڵكو پتر لە هەزار ساڵ لەمەپێش لە چین یا لە دەوڵەتی ڕۆمان یا لە شوێنی‌تر جۆرە بڵاوكراوەی‌وا بووە دەنگوباسی دەوڵەت‌و فەرمان‌و قانوونەكانی میری‌یان تێدا نووسراوەتەوەو هەڵواسراوە بۆئەوەی خەڵك بی‌یانخوێننەوەو لێ‌یان ئاگادار بن‌و بەگوێرەیان بجووڵێنەوەو ، ئەم جۆرە بڵاوكراوانە ناوئەنێن ڕۆژنامە ، ئەڵێم لەگەڵ ئەمەشدا ئەوەمان هەر بۆ ئەمێنێتەوە كە بڵێین ڕۆژنامە بەوجۆرەی ئەمڕۆ خەڵك لە مانای وشەی (ڕۆژنامە) ئەگەن ، پێوەندی‌یەكی بەتینی بە داهاتنی چاپەوە هەیەو هەردووكیشیان پێوەندی‌یەكی پتەویان بە سەرهەڵدانی چەرخی ڕاپەڕین‌و پەیدابوونی بۆرژوای ئەورووپاوە هەیەو ، بۆیە ئەبێ داهاتنی ڕۆژنامە ، وەك داهاتنی چاپ ، بە دیمەنێك لە دیمەنەكانی چەرخی شۆڕشی پیشەسازی واتە چەرخی دەست پێ‌كردنی هەرەس‌هێنانی دەرەبەگی‌و هاتنە كایەی سەرمایەداری دابنێین كە لە سەرەتادا لە ئەورووپاوە دەستی‌پێ‌كرد • بەڵێ ڕاستە چاپ لە سەرەتادا بۆ لەچاپدانی كتێب‌و بەتایبەتی كتێبی ئایینی بەكارئەهات ، بەڵام زۆریشی نەخایاند مەكینەی چاپی چاكترو بەروبوو فرەتر لەوەی یەكەمجار ، دروست‌كراو بەهۆی ئەمەشەوە ڕێگا بۆ بیركردنەوە لە دەركردنی ڕۆژنامە كرایەوە كە بووبوو بە یەكێ لە پێویستی‌یەكانی چەرخی نوێ‌و ، بەمجۆرە ڕۆژنامە لەملاو لەولا وردە وردە سەری هەڵدا •

★ ★ ★

لە ڕیزی وڵاتانی جیهانی شۆڕشی پیشەسازیدا نە دەوڵەتی عوسمانی‌و نە ئێران كە كوردستانیان لەنێوان خۆیاندا كردبوو بە دوو كەرتی گەورەو بچووكەوە ، ناویان نەبوو • ڕژێمی حوكمڕان لە هەركام لەم دوو وڵاتەدا ڕژێمێكی لەبارەی كۆمەڵایەتی‌یەوە دەرەبەگی‌و ، لەبارەی ئایدیایی‌یەوە ئایینی بوو • هەركامیشیان بگری دەوڵەتێكی

پاشکەوتوو و فرەنەتەوەو ، لــە ڕوویەکی کەشەوە خاوەنی سامانێــکی لێشاوکردوو بوو کە سەرمایەداریی چەرخی ئیمپریالیزمی ئەورووپا لێکاوی بە لالغاوەدا بۆ ئەهاتە خوار •

لەئەنجامی وردە وردە کەوتنــە بــەر لێشاوی کومپــانیی‌یە مۆنۆپۆلی‌یەکانی ئەورووپاو گەشەکردنی ناکۆکیی چینایەتی‌و هەست بــە ستەمی نەتەوەیی کردندا ، کەم‌کەم لــەم دوو وڵاتەشــدا بزووتنــەوەی نوێی نیشتمانی‌و نەتەوەیی پەیدابوو • بیری نوێی چــەرخی شۆڕشی فەرەنسە وردە وردە لە هەزار ڕێوە خــۆی گەیاندە مێشك‌و بیــری وەچەیەکی تازە پێگەیشتووی ئەو کۆڕە کۆمەڵایەتی‌یانەی نەتــەوە جیاجیاکانی ئەم دوو وڵاتە کــە سوودو قازانجیان لەگــەڵ شێوەی حوکمڕانی‌و فەرمانداریی پشت بە داوو دەزگــای دەرەبەگی بەستوو ڕێك‌نەئەکەوت • ئەمانە بیریان لە پێکەوەنانی کۆڕو کۆمەڵی سیاسی‌و ڕاگەیاندنی بیرو ڕای خۆیان بە جەماوەری خەڵك کردەوە •

ئەگەر ئەم ڕێبازە نوێیە نەیتوانیبێ بەئاسـانی زووبـەزوو بگاتـە شاخەکانی کوردستان خۆی ، خۆ هیچ‌نەبێ لە قۆناغی یەکەمدا کۆمــەڵێ لەو کوردانەی بۆ خوێندن چووبوونە ئەستەموول یا بۆ هەر مەبەستێکی‌تری کۆمەڵایەتی پێوەندیان پێیەوە پتەو بووە، زووتر لە هاووڵاتەکانی ناوەوەیان توانی‌یان بیری نــوێ وەربگرن‌و ببن بــە مەشــخەڵ هــەڵگری لەنـاو هاونیشتمانەکانیاندا •

لەم مەیدانەدا لەنێوان عەرەبی عێراق ، بەڵــکو هەمــوو عەرەب‌و نێکڕای کوردی عوسمانیدا ماوەیەکی ئەوەندە نەبوو • بە هاتنی مەدحەت پاشا بە والی‌یەتی بۆ سەر عێراق لەساڵی ١٨٦٩ دا یەکەمین ڕۆژنامــەی عێراقی بە عەرەبی‌و تورکی بە ناوی ( زوراء ) دەرچــوو • بە داهـاتنی

سالی ١٨٩٨ یش یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی بە زمانی کوردیو تورکی بە ناوی ( کوردستان ) لە ئەستەموول دەرچوو • بۆیە ئەمڕۆ ڕۆژی ٢٢ی نیسانی هەموو ساڵێك لەناو ڕۆشنبیرانی گەلی کورددا بە ڕۆژی ڕۆژنامەنووسیی کوردی دائەنرێ •

لەوڕۆژەوە تائێستا بەیناوبەینێکی کەم نەبێ کە لەبەر هەندێ بارو دۆخی تایبەتی ڕۆژنامەی تێدا دەرنەچوە ، لە تێکڕای کوردستاندا ، لەم بەشی یا لەو بەشی ، ڕۆژنامەو گۆڤار هەر بووەو شانبەشانی هەموو هۆکانیتری خزمەتی گەلو ڕۆشنکردنەوەی بیری جەماوەرو پیشاندانی ڕێگای ڕاست بۆ دابینکردنی ئازادیو بەختەوەری لە خەباتدا بووە •

★ ★ ★

مەبەستی دیاریکراوی ئەم باسەی ، ئەمڕۆ من لێرەدا پێشکەشتانی ئەکەم ، وەك نەقابەی ڕۆژنامەنووسانی عێراق ، لقی ناوچەی ئۆتۆنۆمی دەستنیشانی کردووە ، دەرخستنی باری لەمەوپێشو ئەمڕۆی ڕۆژنامەی کوردیو بەراوردکردنی ئەم بارەیە لەم دوو چەرخو قۆناغەدا •

لەبەرئەوە ئەبێ پێشەکی شتێ لەبارەی تێکڕای ڕۆژنامەوە وەك بابەتو فۆرم لە جیهانی ئەمڕۆدا باسبکەین ، ئەوجا بێینە سەر ڕۆژنامەی کوردیو بزانین بەمپێیە لەم دوو ڕووەوە لە چیدا بووەو ئێستا گەیشتووەتە کوێ ؟

ئەمڕۆ هەر ڕۆژنامەیەك ئەگرین ، بەپێی قەوارەی خۆی لە گەلێ جۆرو بابەتی تێدایە : دەنگوباسی جیهان ، دەنگوباسی ناوچە ، دەنگوباسی ناوخۆ ، لێکۆڵینەوەی باری سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابووریی جیهانو ناوچەو ناوخۆ لەگەڵ قورسایی خستنێکی تایبەتیی هەر ڕۆژنامەیەك ئەسەر ئەوجۆرە هەواڵانەو هەواڵی ئەو شوێنانە کە سوودی دەزگای بەڕێوەبەری

ڕۆژنامەکەیان پتر پێوە بەستراوە ، گێڕانەوەی بیروباوەڕی کۆڕە سیاسی یەکانی جیهانو بەتایبەتی ڕۆژنامەکان لەبارەی بایەخدارترین بابەتەکانی ڕۆژەوە ، بابەتی کولتوورو ئەدەبو هونەرو زانست ، کاروباری منالانو ئافرەتانو لاوانو قوتابی یان ، نەقابەکانی کرێکاران ، وەرزش ، دەنگوباسی ناسیاسی ، هەواڵی سەیرو سەمەرە ، بەرنامەی ڕادیۆو تەلەفزیۆن ، جاڕی کەلوپەلی فرۆتنەیو هەواڵیتری تایبەتی کە خاوەنەکانیان مەبەستیانە خوێندەواران پێیان بزانن ، بابەتی بێتاقەتی وەك شەوچەرەی کولتووری •

لە مەیدانی جیاوازیی ڕۆژنامەدا لە یەکدی لەناو خۆیاندا ، ئەبێ پەنجە بۆ جیاوازیی تێکڕای ڕۆژنامەی ولاتانی سەرمایەداریو سۆشیالیستی لە یەکتر ڕاکێشین • لەناو ڕۆژنامەکانی ولاتانی سەرمایەداریشدا ئەبێ ئەوە بڵێین کە ڕۆژنامە کۆمۆنیستی یەکانی ئەم ولاتانە تێکڕا شێوەیەکی تایبەتی یان هەیە کە لەپاڵ ڕاگیرکردنی کاکڵە ئایدیاییی یەکەیاندا فۆرمی گشتیی ڕۆژنامەی ولاتانی سەرمایەداری یان تێدا پارێزراوە • کە دێینە سەر جیاوازی یەکانی تێکڕای ڕۆژنامەی ولاتانی سەرمایەداریو سۆشیالیستی لە یەك ئەوەی بەئاسانی ئەتوانرێ دەستنیشان بکرێ ، یەكڕاییی هەموو ڕۆژنامەکانی هەر ولاتێکی سوشیالیستی یە بەتایبەتی لە بابەتە بەبایەخەکاندا ، خۆقورس گرتنە لەئاست هەندێ بابەتی وا کە لەڕووی پەروەردەکردنی گیانی مرۆوە لای باری سەرنجی سۆشیالیستی ، وەك شتێکی جوزئی ، ئەوەندەی بایەخ نی یە با ئەگەر بلاویش بکرێتەوە سەرنجی خەلکێکی فراوان ڕاکێشێ ، پەلەنەکردن بۆ ڕادەربڕین بەرابەر بەو ڕووداوە گەورانەی ڕووئەدەنو حوکم لەسەردانیان پێویستی بە هەلسەنگاندنی هەموو سەرێکیانە ، دەرنەبڕینی

هەواڵی تاوانو ڕووداوی کۆمەڵایەتیی سەیرو سەمەرە • بەرابەر بەمە ڕۆژنامەی وڵاتی سەرمایەداری ، یا وردتر بڵێین ڕۆژنامەی بۆرژوازی لـــە وڵاتێکدا کـــە لەژێر سیستێمیکی فـــەرمانڕەواییی دیموکراتی بۆرژوازیدا بێ ، بـــە مەیداندانی ئازادەیەکی زۆری پیشاندانی بیـــرو ڕای جیاواز ، بڵاوکردنەوەی هەر جۆرە بابەتێ کە خوێندەوار زۆرتر ڕایبکێشێ بۆ کڕینی ڕۆژنامەکە بێ گوێدانە ئەوە سوودی ئـەو بابەتانـە بۆ کۆمەڵو جەماوەر چەندە ـ شەقڵی ڕێبازی خۆی دیاری ئەکا •

لێرەدا ئەبێ ئەوە بڵێم ئـــەم جیاوازییەی ڕۆژنامـــەی وڵاتانی سەرمایەداریو سۆشیالیستی ، ئەگەر وردبینەوە ، بە نیشانەی ئـــەوە دانانرێ کە ڕۆژنامەی بۆرژوازی بیری ئازادەو ڕۆژنامەی سۆشیالیستی بەپێچەوانەوە • لەوانەیە بووترێ لەولا ئازادەیەك بەر بەرەڵایی‌و لەملا ئازادەیەك تەسككردنەوەی مەیدانی دەربڕینی بیر بەرچاو ئەکەوێ ، بەڵام مەسەلەکە لەبنەڕەتا ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کـــە ڕۆژنامەی بۆرژوا هەرچەند ئازادانە ڕادەربڕێ ، ئازادییەکـــەی بۆ ئەوەیە ســـوودی سیستێمی سەرمایەداریی چاکتر بپارێزێو لای‌وایە ئەو ڕایەی ئـــەو پەسەندی‌ئەکا سوودی چاکتری چینی بۆرژوای پێ دابین ئەکـــرێ • سەرەڕای ئەوە ئەم ئازادییە هیی ئەوخۆی نی‌یە دابێتی ، کۆمەڵانی گەل بـــە خـــەباتی سەختی ساڵەهای لە شۆڕشی پیشەسازی‌یەوە تا ئەمڕۆیان دەستیان‌خستووەو ئەمڕۆ ٩٠٪ی بەری ئەو خەباتە بە حوکمی واقیعی چینایەتیی ناو کۆمەڵگای سەرمایەداری بۆ بۆرژواکـــان خۆیانو بـــۆ ئەوانەیە بیروباوەڕی ئەوان هەڵئەگرنو تەنها ١٠٪ی بۆ چینی کرێکارو گەلی ڕەنجکێشە کـــە بە حوکمی نەدارایی هۆیەکانی هێنانە بەرهـــەمو نەدارایی هۆیەکانی ڕاگەیاندن ئازادییەکەیان تەنها وەك شتێکی دەمی‌و

خەیاڵی ئەمێنێتەوەو بە هیچ کلۆجێ لەگەڵ ئازادیی بۆرژوازی‌یەکان بەراورد ناکرێ • بەڵام لە وڵاتی سۆشیالیستیدا چینی کرێکارو گەل خاوەنی هەموو شتێکە ، هەرچەند لێرەو لەوێ ، لە مەیدانی پراکتیکا هەڵە یا دەستدرێژی ڕووبدا ، یا توێژاڵێکی بیرۆکرات بەسەر ڕووی حوکمڕانی‌یەوە پەیدا بێ‌و ناووبانگی دەسەڵاتی گەل ناشیرین بکا • لەمەش بەولاوە ڕۆژنامەی وڵاتی سۆشیالیستی بە حوکمی ئەوەی لەلایەن دەوڵەت‌و حیزب‌و ڕێکخراوەکانی جەماوەرەوە بەڕێوەئەبرێ ، لە سیاسەتی وڵات جوێ‌ناکرێتەوە ، بەڵام ڕۆژنامەی بۆرژوازی هەردەم ئەتوانێ ، وەك بەشێکی برگەی سەرمایەداری ، لەئاست لێ‌پرسینەوەی سیاسی‌و ئەخلاقی شان هەڵتەکێنێ‌و سەنگ‌و قورسی‌یەك بۆ قسەی خۆی دانەنێ • بە واتەیەکی‌تر ڕۆژنامەی سۆشیالیستی لە یەك ڕێگاوە داکۆکی لە قازانجی چینی حوکمڕان ئەکا ، لەبەرئەوە یەك شارێی هەیە بۆ دەربڕینی بیر بەڵام ڕۆژنامەی بۆرژوازی بەحوکمی ئەوەی لەناو کۆمەڵدا دەیان کەڕەت لە بیرو دەسەڵاتی سۆشیالیزمی تازە هاتووە دنیا ڕیشەی داکوتاوترەو ، ڕێگای زۆری هەیە پەلیان لێوە ئەهاوێ بۆ ناو کۆمەڵ ، ڕێگای دەربڕینی بیریشی زۆرەو ئەوەی لا مەبەستە کە لە دوا لێکدانەوەدا هەموو ڕێگاکان بۆ (بانە) بچن‌و زەرەرێ بە پەزەکانی سەرمایەداری نەگا •

جیاوازی‌یەکی‌تری ڕۆژنامەی وڵاتانی بۆرژواو وڵاتانی سۆشیالیستی نە سەرچاوەی دارایی ڕۆژنامەدایە کە دەورێکی زۆری لە دیاری‌کردنی ڕێبازی سیاسیی ڕۆژنامەدا هەیە • لە وڵاتانی سەرمایەداریدا ڕۆژنامە هیی کومپانی یا هیی تاکەکەسە • تەنانەت ڕۆژنامە کۆمۆنیستی‌یەکانیش لەم وڵاتانەدا ، بەحوکمی ڕژێمی ئابووریی

وڵات ، ئەو دەزگایانەی دەریان ئەکـەن لەناو خۆیانـدا کومپانی یـەکی قانوونی یان بۆ موڵکیەتی ڕۆژنامەکـــە پێکەوەناوە • لـــە وڵاتـــە سەرمایەداری یەکاندا گەلێ کومپانیی گەورەی وا هەیە یەکی چـــەند ڕۆژنامەو گۆڤار بەملیۆنەها دانە بڵاوئەکەنەوەو بەمجۆرە دەستیان بەسەر دیاری کردنی ڕێبازی بیری ڕای گشتیدا گرتووەو بە ڕێـگای سـوودی سەرمایەداریدا ڕێ بەدێیی ئەکەن و ئەگەر ڕۆژنامەیەکی پێچەوانەشیان ڕاست بێتەوە ، لەبەر کەمدەسەڵاتی دەنگی ئەوەندە کزە لە چوارچێوەی بەشێکی کەمی کۆمەڵدا نەبێ کـەس گوێی لێ نی یە • لـــە وڵاتی سۆشیالیستیدا ڕۆژنامە هـــەمووی هیی دەوڵـــەت و چینی حوکمڕان و حیزب و ڕێکخراوە کۆمەڵایەتی یـەکانیەتی • دوو چینی چەوسێنەوەو چەوساوەش نی یە ، تا ئەو دەسەڵاتە بێ بەهۆی دەمکوت کردنی چینی چەوساوە ، لەبەرئەوە پێکەوەنانی ڕای گشتی هـــەر بۆ سوودی ڕای گشتی خۆی و بۆ سوودی سۆشیالیزمە •

ڕۆژنامەکانی جیهان ئەمڕۆ هـــەموو هەوڵی ئەوە ئەدەن هەریەکـە بەگوێرەی دەستەڵاتی خۆی و شوێنی لە کۆمەڵداو شوێنی وڵاتەکەی لـە مەیدانی جیهانیدا باشتر بتوانن لـــە ئەمڕۆو سبەینێی پێوەندی نێوان دەوڵەتان بکۆڵنەوەو پێشبینیی وردترو باشتر پێشکەش بکەن ، بۆئـەوەی بتوانن هەریەکە بەپێی سوودی سیاسیی خۆیان باشتر جڵەوی کـــاری دواڕۆژ بەلای خۆیاندا وەرسووڕێنن • هەوڵ ئەدەن لـــە هەر مەیدانێکا کارامەترین کـــەس لە خۆیان کۆبکەنەوە • بەتایبـــەتی ڕۆژنامـــە بۆرژواکان کـــە ئەبینن لـــە هەموولایەك ئاگری خەبات لـــەدژی ئەمپریالیزم و خوێنمژین و لەپێناوی ئازادیی سیاسی و ئابووریی گـــەلانا زیاتر گڕئەسێنی ، ئەیانەوێ باشتر پەنجە بخەنە ناو کون و کەلەبەرەکانی

سیاسەتی دەوڵەتانەوە ، زۆریان بۆخۆیان بوون بە دەزگایەك لەو دەزگایانەی لە بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات یا ناوچەو بەڵکو جیهانیشدا جێپەنجەیان دیارە •

ڕۆژنامەی حیزبە سیاسی یەکانیش لەو وڵاتانەدا کە کێشمەی حیزبی یان تیایەو کۆمەڵ لە چەند چینی جیاواز پێکهاتووەو ، هەر چینە حیزبێك یان زیاتری هەیە ، بەگوێرەی دەستەبەندیی سوودی کۆمەلایەتی لەناو چینەکەدا ، هۆیەکی گەورەی گەیاندنی بیرو ڕای حیزبەکەن بە جەماوەر • ئەمڕۆ هیچ حیزبێك نی یە لە جیهاندا بتوانێ بێ لای کەمی ڕۆژنامەیەك بژی کە بیروڕای بە جەماوەر بگەیەنێو پڕوپاگاندەی بۆ بکا لەناویاندا و شەڕی دوژمنی لێ دووربخاتەوە • بۆیە ئەبینین لە هەموو ئەو وڵاتانەدا کە ئازادی یە دیموکراتی یەکانیان تێدا پێشێل کراوە ، حیزبەکان هەوڵ ئەدەن بڵاوکراوەی نهێنی یان ببێو ، تەنانەت هۆی ڕاگەیاندنی لە ڕۆژنامە بەدەستو بردتریش وەك ئێسگەی ڕادیۆو شریتی کاسێتو شتی وا ناتوانێ جێگەی ڕۆژنامە بگرێتەوە ، چونکە ڕۆژنامە وەك دەکومێنتێکی هەڵگیراو لە فەوتان نایێو نکوولیشی لێ ناکرێو خاوەنەکەی ناتوانێ بلێ فلانە قسەم نەکردووەو فلانە هەڵوێستم نەبوە مادەم خستبێتیە سەر لاپەڕەی قاقەز •

★ ★ ★

لە ڕووی تەکنیکیشەوە ئەوەی سی ساڵ لەمەپێش لەم عێراقی ئێمەدا ڕۆژنامەی خوێندبێتەوەو ئێستاش مابێ ، ئەزانێ چ جۆرە جیاوازی یەك لەنێوان ڕۆژنامەی ئەوساو ئێستادا پەیدابووە • جاران وتارەکانی ڕۆژنامە بە پیتی تاك ڕێك ئەخران • وێنە یا هەر نەبوو یان ئەبوو لە کارگەکانی زەنکۆگرافدا بکرایە بە کلیشە • مانشێت نەبوو ،

بۆ دەرخستنی هەواڵێکی بایەخدار یان دروشمێکی زۆر مەبەست هەر پیتی گەورە هەبوو بەفریادا بگا • پاشان وای لێهات خۆش‌نووسێك هەواڵەکە یان دروشمەکەی ئەنووسیو یەکێکی تر لەسەر ماددەیەکی وەك پلاستیك دای ئەناو بە کاربۆن ئەینووسییەوەو ئەوجا دەورو بەرەکەی ئەتاشی تا وێنەی خەتی خۆش‌نووسەکە وەك پیتی درشتی قورقوشمی لێ دەرئەچوو و ئەیانخستە ناو مەکینەی چاپەوە • هەنگاوێکی تر بەرەوپێش چووین خەتی خۆش‌نووسەکەمان ئەبردە زەنکۆگراف‌و ئەمان کرد بە کلیشە • لەبەرئەوە لەو سەردەمەدا ڕۆژنامە لە ٤ لاپەڕەو زۆر خۆی بکوشتایە لە ٨ لایەڕە تێ نەئەپەڕی • لەبارەی ژمارەوە ئەگەر زۆری لێ دەربچوایە بەحاڵ ئەیگەیاندە ١٠ هەزار ژمارە • تەنها پاش شۆڕشی ١٤ی تەمووزو هەر بەش‌بەحاڵی یەکێ لە ڕۆژنامە هەرە بەبرەوەکانی ئەو سەردەمە توانی بیگەیەنێتە ٢٠ هەزارو هەندێ جاریش لێی تێپەڕێنێ • ئەمە هەمووی بەهۆی نەبوونی خوێندەواری ڕۆژنامەخوێنەوە نەبوو ، بەڵکو هیی ئەوەش بوو تەکنیکی چاپ لە عێراقدا پاشکەوتوو بوو • ڕۆژنامە بۆ ڕۆژی دووهەمی دەرچوونی ئەگەیشتە مەرکەزی لیواکان • مەگەر هەرە نزیکەکانیان لە بەغداوە لە یەکەم ڕۆژدا پێیان بگەیشتایە • بۆ هەواڵ وەرگرتنیش ئەبوو ڕۆژنامەنووسێك بەدیار ڕادیۆوە دانیشتایە لێی وەرگرتایە • زۆر لە ئێسگە گەورەکان بەرنامەیەکیان بڵاو ئەکردەوە لەو بەرنامەیەدا هەواڵیان بەئاستەم ئەخوێندەوە تا ڕۆژنامەنووس بتوانێ پیادا بگاو بینووسێتەوە • پاشان ڕیکۆردەر داهات کە هەواڵی لەسەر شریت پێ تۆمار ئەکراو لێ ئەدرایەوەو لەبەری ئەنووسرایەوە • پەیامنێری شاران ئەبوو خۆی بێت هەواڵەکانی بینێ یا بە یەکێکی متمانەپێ‌کراودا بینێرێ •

هەرچەند عێراقی ئێمە هێشتا لـەم مەیدانەدا زۆر هەنگاو لەدوای وڵاتە پێشکەوتووەکانەوەیە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەچاو ڕابووردوودا شتی زۆر گەورە کراوە • ئەمڕۆ پیتڕێکخستن نەمـاوە ، بەڵکو لە زۆر ڕۆژنامەدا داڕشتنی دێڕی قوڕقوشمیش نەمـاوە • ئێستا دێڕ بە شێوەی ئەلکترۆنی ئەنووسرێو چـاپ هەمووی بـە فلیـم بـۆ کـردنو پلێتـە دروستکردنو بە شێوەی ئۆفسێت تەواو ئەکرێ کە لەتوانادا هەیە لـە چـەند دەقیقەیەکدا هەزاران دانە بە چەند ڕەنگ بهێنرێتە بەرهـەم • ئـەمڕۆ لە هەر ڕۆژنامـەیەکی بایەخـدارا ئامێری تایبـەتیی‌وا هەیـە هەواڵی لە ئاژانسەکانی دەنگوباسی ناوخۆو دەرەوە پێ وەرئەگیرێو هەر بـەو ئامێرەش ئەنووسرێتەوەو ئەدرێتە دەسـتی ڕۆژنامـەنووس بەپێـی سیاسەتی ڕۆژنامەکەی دەسکاریی تێدا بکاو ئامادەی بکا بۆ بڵاوکردنەوە • نەك هـەر هەواڵ ، بەڵکو وێنەش هـەر بەمچەشنە بە ئامێری تایبەتی لـە وڵاتانی دوورەوە وەرئەگیرێو ئەگاتە سەر لاپەڕەی ڕۆژنامـە • بۆ دەستخستنی هەواڵو وێنە لە ئاژانسەکانەوە ئەبێ ڕۆژنامە ببێ بـە ئابوونەو ساڵی بۆ ئەم مەبەستە پارەیەکی زۆر بەو ئاژانسانە بدا •

بەڵام ئەمەی کـە وتمان ، نە ئەوەی لەمـەپیشی‌و نە ئەوەی ئێستای ، ڕۆژنامەی کوردی ناگرێتەوە ، ئەوەیش لەبەر هۆیەکی زۆر سادەو ئاسان کـە ئەوەتە لـە جێگیربوونی حوکوومەتی خۆماڵی‌یەوە لـە عێراقدا تا شۆڕشی ١٤ی تەمووز ڕۆژنامەی سیاسیمان نـەبوەو ، لەوەپاشیش جارجارێ کە بووە هەرگیز لەئاستی ئەوەدا نەبوە بیر لـەم شتانە بکاتەوە کـە بۆ ڕۆژنامەیەکی لات بـە خۆراکی خواپێداوان دائەنرێ • تەنانەت ( هاوکاری ) یە دەوڵەتی‌یەکەی ئێسـتایشمان هـەر ئەوەندەی لە تەکنیکی نوێ پێ براوە کە بە ئۆفسێت لەچاپئەدرێ •

★ ★ ★

لـــه جیهانێکدا کـــه سەربەندی هەمووشتێکی له هەمووڵایەکدا تێـــدا ئەچێتەوه سەر سیاسەت‌و سیاسەتیش لە هەمووڵایەك بریتی‌یه لـــه کـێشـــه لەسەر فەرمانڕەوایی لەنێوان هێزه دژبەیەکەکاندا ، چ لـــــه ناوخۆو چ له دەرەوەو چ له مەیدانی شەڕی دەستەویەخه یا شەڕه بیر یا شەڕی سوودو قازانجی تایبەتیدا ، بەڵێ لـــه جیهانێکی‌وادا ناتوانین حوکمی موتڵەقی پێشکەوتن یا پاشکەوتن بەسەر هەموو شتێکدا بدەین •

ڕۆژنامەی کوردی له کۆنەوه تا ئەمڕۆ که مەیدانی قسەلێکردنی ئـــەم دانیشتنەمانه ، یەکـــەم هەنگاوی کـــه به دوو پێی باریك‌و لاوازی ڕۆژنامەی (کوردستان)ی میقداد مەدحەت بەدرخان نای ، بەرەو ئامانجی «وریاکردنەوەی کوردان‌و هاندانیان بۆ ئارەزووی پیشەسازی» نای • مەعنای ئەمه له زمانی لێکۆڵینەوەدا واته گـــەڕان بەدوای دۆزینـــەوەو وەرگرتنەوەی مافی میللیـــدا پاش ســاڵەهای دوورو درێـــژی دیلـــی‌و نووستن‌و بێ‌ئاگایی‌و ، ڕزگاربوون له داوی دەرەبەگی‌و چوونه چەرخی سەرمایەداری‌یەوه که بەش‌بەحاڵی ئەوڕۆژەی کوردستان‌و هـــەموو وڵاتانی ڕۆژەڵات هەنگاوێکی پێشکەوتوو بوو • لـەوڕۆژەوە تـا ئـەمڕۆ ئامانجی ڕۆژنامەی کوردی تێـــکڕا لـــەم چوارچێوه پێشکەوتووه دەرنەچوه • بەڵێ وابووه داگیرکەرێك یا حوکوومەتێکی کۆنەپەرست‌و دوژمن به گەل ڕۆژنامەیەکی بۆ سوودی خۆی به کوردی دەرکردووه ، بەڵام ئەویش هـــەر ناچار بووه لـــه بەرگێـــکی پێشکەوتخوازی یـــا کوردایەتیدا بۆ ئامانجه کۆنەپەرستانەکەی خۆی تێبکۆشێ • ئـــــەم ڕاستی‌یه نەك هـــــەر لــــه ڕۆژنامەیەکی وەك «تێگەیشتنی ڕاستی»دا دەرئـــەکەوێ که لـــه بــارو دۆخێـــکا دەرچـــوو کوردســتان ئەوەنـــده پاشکەوتوو بوو هەرجۆره گۆڕانێك ڕووی‌بدایه ئەبوو به ناچاری سەرێکی پێشکەوتووی ئاشکراشی هەبێ، بەڵـکو تەنانەت له بەناو (کوردستان)ەکەی

حەمەڕەزا شای ئێران‌و لە ( پەیام ) ەکەی بالیۆز خانەی ئەمەریکاشدا لـە بەغدا ، بە زەقی دەرئەکەوێ • بەڵام بەرانبەر بەمە ڕۆشنبیرانی دڵسۆزی کوردیش پلانی خۆیان بووەو زۆر جار خۆیان گەیاندووەتە ئەوجـۆرە ڕۆژنامانەش‌و بۆ سوودی گەلەکەیان با تەنها لە مەیدانی زیندووکردنەوەی زمان‌و ئەدەب‌و مێژوویشدا بێ بەکاریان‌هێناون • ئەم ڕاستی‌یەش هەروەها لەو ڕۆژنامانەدا کە ناوم هێنان‌و لە ڕۆژنامەو گۆڤـاری‌تریشـدا دیاری هەر داوە •

دەوری ڕۆژنامەی کوردی لە ڕۆشن‌کردنەوەی ڕێـگای سـیاسیی نـەتـەوەی کـورددا بـەدرێژایی مێـژوو ، شـایانی بایـەخ‌پێـدان‌و توێـژلێ‌هـەڵدانەوەو لێکـۆڵینەوەیە • یـەکەم ڕۆژنامـەی کـوردی ، ( کوردستان ) ، بێ‌ئەوەی کە خۆی مەبەستی بووبێ‌و دەرکی‌پێ‌کردبێ، بە دەرچوونی لە قاهیرە ، دوو نیشانەی گەورەی لە ڕێـگای نەتـەوەی کورددا دانا کە نەتەوەی کورد تا ئەو دوو نیشـانەیەی لە بەرچـاو بێ‌و ونیان‌نەکا ، بە بۆچوونی من ، باشترو ڕوونتر ڕێگای پاشـەڕۆژی پـێ دیاری ئـەکرێ • ئـەو دوو نیشـانەیەش یـەکەم بایـەخی ئـازادی‌یە دیموکراتی‌یەکانە لە گەشەکردنی گەلداو ، دووهەمیش یەکـێتیی خەباتی گەلانی هاوئامانجە بۆ گەیشتنیان بـە ئامانجیان • کە بیـر لە دەرکردنی ( کوردستان ) کرایەوە وڵاتانی عوسمانی لەژێر باری قورسی حـوکمی ملهوڕانەو خودسـەرانەی عەبدولحەمیددا بـوون • مەیـدانی دەربڕینی دەنگـێکی ئازاد لە سەرانسەری وڵاتی عوسمانیدا نەبوو • بۆیە میقـداد مەدحەت بەدرخان پەنای‌بردە بەر قاهیرە کە ئەو سەردەمـە چـەردەیەك تیشکی ئازادیی بیری لە ئەورووپاوە گەیشتبوویەو لەژێردەستی عوسمانی دەرچووبـوو ، هـەرچەنـد خۆیشـی نیمچـە موستەعمـەرەی وڵاتـە

ئەمپریالیستی یەکانی ئەورووپا بوو • ئەمە دەرزی یەکەم بوو بۆ کورد لە بابەتی بایەخی ئازادیی دیموکراتیدا بۆ گەل • نیشانەی دووهەمیشـی ئەوەیە عەرەب و کورد تێکڕا لەو گەلانە بوون کە لەژێر باری جـەورو ستەمی عوسمانیدا ئەیاننالاند • باوەش کردنەوەی قاهیرەی عەرەب بـۆ ڕۆژنامەیەکی کوردی ، هەم نیشانەیەکی تری یەکێتیی خەباتی گەلانی بەش خوراوو ، هەم هەنگاوی یەکەمە بە ڕێگای دانانی بناغەی کـۆشکی پتەوی برایەتیی گەلانی عەرەب و کورددا لە خەباتدا لەدژی ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستیی ناوخۆ کە ئێستاش بەش بەحاڵی ئێمەی کوردو عەرەب لـە عێراقدا، وەك چۆن بەدرێژاییی ساڵانی خەباتمان بۆ ئازادی و دیموکراسی و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی یش وابووە ، هەر مەرجێکی گەورەی سەرکەوتنی هەردولامانە • هەر لە بەر ڕووناکیی ئەو تەجرەبەیەو بەهۆی ئەو دەورە پڕشانازی یەوە کە پێشەنگانی بزووتنەوەی نیشتمانی و دیمـوکراتی لـە عێراقدا دیویانە بۆ زاخاودانەوەی بیری جـەماوەری عـەرەب و کوردی عێراق بە بایـەخی برایـەتی و یـەکێتیی خەبات ، لـە دابین کـردنی سـەرکەوتنی یەکجاریی گەل و گەیشـتنیدا بە هەمـوو ئامانجـەکانی ، ڕۆژنامەی کوردی یش، بە نهێنی و ئاشکرایانەوە ، بەتایبەتی نهێنی یەکانیان، هەمیشە کەم و زۆر دروشمی برایەتیی کوردو عەرەب و یەکێتیی خەباتیان هەڵگرتووە و ، ئەمەی کە ئەمڕۆ ئەیبینین کەوا ئەم دوو گەلە لەگەڵ ئەو هەموو تاڵی و سوێری یەش کە لە ژیانی سیاسیی خۆیاندا دیویانە ، وەك گـەل و وەك جـەماوەر ، نـەکەوتوونەتـە سـەر لاڕێی شـۆڤێنیـەتی و دوورەپەرێزی لە یەك و ئەوانەی کە ئاگری کینەی نەتەوەیی یان لەنێوان عەرەب و کورددا تیژ کردووە ، هەمیشە لە بەرچاوی جەماوەری فراوانی گەلدا وەك کۆمەڵێکی سەرلێشێوێن تەماشا کراون • بەڵێ ئـەم دیـاردە گرانبەهایەی باوەڕ بە برایەتیی عـەرەب و کوردە کە ئەمڕۆش لەنـاو

جەماوەردا بە باشی هەستی پێ ئەکەین ، یەکێکە لە ئەنجامە بەنرخەکانی کاری گەلێ لاو دەزگاو لە ڕیزی پێشەوەیانەوە ڕۆژنامەی تێکۆشەری کوردی •

★ ★ ★

هەروەك ( کوردستان ) لە سەردەمی خۆیدا، لە ماوەی بزووتنەوەی سمکۆشدا ڕۆژنامەی ( ڕۆژی کورد ) ، لە ماوەی حوکمڕانیو خەباتی شێخ مەحموودا ( بانگی کوردستان ) و ( ڕۆژی کوردستان ) و ( بانگی احەق ) و ( ئومێدی ئیستیقلال ) و ، لە سەردەمی کۆمەڵەو کۆماری مەهەبادا ( کوردستان ) و دەستەخوشکەکانیو ، لە چەرخی پاشایەتیی عێراقدا ( نزار ) و پاش شۆڕشی تەمووز ( ئازادی ) و ( خەبات ) و ( کوردستان ) و ( ڕای گەل ) و ( ڕۆژی نوێ ) و لە ١٩٦٧ ەوە ( برایەتی ) وەك ڕۆژنامەی سیاسی ، هەموو پێشەنگو پێشەوای خەباتی گەلی کوردو ڕوونکەوەی ڕێگای بوون • ئەمە جگە لەو هەموو گۆڤارو ڕۆژنامە ئەدەبیو گشتیو کۆمەڵایەتییانەی کە لە مەیدانی ئەدەبو زمانو کۆمەڵایەتیو پێشکەوتنی شارستانەتیدا دەوریان لە دەوری سیاسیی ئەو ڕۆژنامە سیاسییانە کەمتر نەبوە کە بەدرێژاییی ئەم نزیکەی ٩٠ ساڵە دەرچوون • بەڵکو لە مێژووی ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا کە بە هۆی بارو دۆخی وڵاتەوە زوربەی وەخت مەیدانی دەرکردنی ڕۆژنامەی سیاسیی کوردی نەدراوە ، زۆر جار ڕێکەوتووە ڕۆشنبیرانی کورد ڕۆژنامەی ئەدەبیو کۆمەڵایەتییان لەڕاستیدا کردووە بە ڕۆژنامەی سیاسیو بەشی زۆری ئەو ئەرکە سیاسییانەیان پێ بینیون کە بە ڕۆژنامەی سیاسی ئەبینرێن • (گەلاوێژ)ی ساڵانی ١٩٣٩ - ١٩٤٩ ، (ژین)ی ساڵانی ١٩٥٣ - ١٩٥٤و (بیری نوێ)ی ساڵانی ١٩٧٢-١٩٧٩و

(هاوکاری)ی ئەم دوازدە ـ سیانزە ساڵەی دوایی ، نموونەیەکی ئاشکرای ئەمەن‌و ، ئەم ڕۆژنامانەو گەلێکی‌تر دەورێکی باڵایان لەم مەیدانەدا بووە • لەگەل ئەوەشدا کە تا شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ ئەو ولاتانەی کە یەکی بەشێکی کوردستانیان بەرکەوتووە زیاتر لە ڕووی سیاســـەتەوە دۆست‌و هاوڕێ‌و هاوبیری یەك بوون ، هەرگیز مەیدانی ئەوەیان نەداوە ئەو یەکێتی‌و دۆستی‌و هاوپەیمانەتی‌یەیان بـــگاتە ئەو ئەنجامەش کـــە تەگەرەکانی ڕێی پێوەندی نێوان بەشـەکانی کوردسـتان سـووك ببێ ، چونــکە نەیانویستووە کوردی ئەم بەشانە پێوەندیان بەیەکەوە ببێ ، بەڵام هێشتا هـــەر کـەم تا زۆر ڕۆژنامەیەك لـــە هەرلایەکیان دەرچووبێ ، گەیشتووەتە ئەو لاکانیش • بەم‌جۆرە (هاوار)ی کوردەکانی ســـووریا ئەگەیشتە عێراق‌و تورکیاو تیشکی (گەلاوێژ)ی لە عێراق هەڵتوویش ئەیدا لـــە ئێران‌و سووریاو ، بەتایبەتی (کوردستان)ی مەهابادو دەستە خۆشکەکانی بە شـێوەیەکی ڕێکوپێـك‌و بێ‌ئـەوەی داوای ڤیـزە لـە کاربەدەستانی تورکیاو عێراق‌و ســووریا بکەن لە ســنوور ئـەپەڕینەوەو مژدەی بەیانی نوێی کوردی ئەودیویان بۆ برایانی نزیك‌و دوور ئەبرد • بەم‌جۆرە ڕۆژنامەی کوردی دەورێکی باڵای لە وریاکردنـەوەی گـەلی کوردو بەتایبـەتی لە بەیـەك ناسانـدنی ڕۆشـنبیران‌و خوێندەوارانی‌ــــ سەرانسەری ناوچەکانی کوردستاندا بە یەکتر بینیوە •

★ ★ ★

پێشتر وتمان تا ئەم چەند ساڵەی دوایی مەیدانی قســـە لـــە پێش خستنی تەکنیکی ڕۆژنامەنووسی نەبوو لە عێراقدا ، نـــەك هـــەر بەش‌بەحاڵی ڕۆژنامەی کوردی ، بەڵـــکو بۆ ڕۆژنامەی عەرەبی‌یش ،

بەڵام باری سەرشانی ڕۆژنامەی کوردی لەم مەیدانەشدا گەلێ قورستر بوو • سەرەڕای ئەوە کە کورد نەیتوانیبوو ئەو ئەندازە ئازادی‌یە بۆ خـۆی داسەپێنێ کە بـۆ عـەرەب لوابـوو دایسـەپێنن ، گـەلێ گیروگـرفتی گەورەی‌تریشـی لە مەیـدانا بـوو • بۆنموونـە ڕۆژنامـەی کـوردی تێکڕا یا پیتی دەست‌نەئەکەوت یا کرێـکاری کورد نەبـوو پیتـەکانـی بچنێ ، یا بابەتی‌وای بۆ نەئەهات کـە بە بێ‌دەستکاری‌و داڕشتنەوەو هەر هیچ نەبێ بە بێ سەرلەنوێ نووسینەوە بۆ ئەوە بشێ بخرێتە بەردەستی کرێـکاری چـاپخانە ، یا دەرامەتی هـەرگیز ئەوەندە نەبوە ئەرکی لـەچاپـدانی دەربێنـێ‌و لـەبەرئەوە پتر پشتی بـە لێبووردوویی کارگێڕەکانی‌و یارمەتیی هـەندێ کوردی دڵسۆز بەستووەو بـەوە بەڕێ‌چـووە • هەر بۆیەشـی تا شـۆڕشـی ١٤ ی تەمووز تاقـانـە ڕۆژنامەیەکی کوردی کە هەبوو ، ئەدەبی‌و کۆمەڵایەتی بوو • لەپاش سەرکوت‌کردنی بزووتنەوەکانی شێخ مەحموودیشەوە تا ١٤ ی تەمـووز تەنها چەند مانگێکی پاش ڕاپەڕینەکەی کانوونی دووهـەمی ١٩٤٨ کوردی عێراق ڕۆژنامەیەکی سیاسیی قانوونی‌یان بەخۆیانەوە دیوە کـە گۆڤاری (نزار)، کـە بە کوردی‌و عـەرەبی دەرئەچوو ، بۆیـە بەدرێژاییی ئەو ماوەیە ڕۆژنامەی سیاسی هـەر نهێنی بـووە ، بـەڵام بەئاشـکرا جێی خۆی لەناو ڕیزی میللەتـدا کردووتـەوەو بـووە بـە پێشەنگی خەباتی بۆ ئازادی •

لەپاش دامرکاندنەوەی بزووتنەوەکـانی شێخ مەحموودەوە تـا دواڕۆژی ڕژێمی پاشایەتی ، لە سلێمانی تەنها (ژیان)و (ژیانەوە)و پاشان (ژین)، لـە ڕەواندز (زاری کرمانجی)و لـە هەولێر (ڕووناکی)و پاشان (اربیل ـ هەولێر)و ئەوجا (هەتاو) دەرچووەو ، لـە بەغدایش (گەلاوێژ)، (نزار)و (پێشکەوتن)و (هیوا) دەرچووە • پێش ئـەو

ماوەیەش ناوەناوە هەندێ وردە گۆڤار لە بەغدا بە کوردی دەرچووە •

ئەم وەزعە مەیدانی ئەوەی نەدا ڕۆژنامەنووسی کارامەو شارەزای کورد پێ بگا ، چونکە ڕۆژنامە پێی نەئەکرا کەس بەڕێوەبەرێ‌و کەس نەیئەتوانی بۆ ژیانی ڕۆژانەی پشت بە ڕۆژنامەنووسی‌یەتی ببەستێ • شۆڕشی ١٤ی تەمووز لە سەرەتادا دەرگای ئاواڵە کردو چەند ڕۆژنامەو گۆڤاری سیاسی‌و ئەدەبی‌و کۆمەڵایەتی بە کوردی دەرچوون • کادری ڕۆژنامە سیاسی‌یە کۆنە نهێنی‌یەکانی چەرخی پاشایەتی‌و کۆمەڵێ لاوی‌تری تازەکاری خوێن گەرم بە چەکی بڕواوە هاتنە مەیدان‌و توانی‌یان زووبەزوو هونەری ڕۆژنامەنووسی بە سەنگ‌و ترازووی ئەو سەردەمە فێر ببن • لەبەرئەوەش کە تێکڕا ئەرکی نووسینی سیاسی‌و ئەدەبی لە ئەستۆی کادرە کۆنە پێگەیشتووەکاندا بوو ، کادرە لاوەکان توانی‌یان بەکاوەخۆ کەلێنەکانی‌تری ڕۆژنامەکان پڕبکەنەوە •

بەڵام بەداخەوە ناوازیی ئامانجەکانی شۆڕش‌و کاربەدەستانی شۆڕش زۆر زوو ئەو تەجرەبەیەشی زیندەبەچاڵ کردو هەر مایەوە سەر ( ژین ) و ئەو چەند ڕۆژنامەو گۆڤارە کە لە چەرخی پاشایەتی‌یەوە هەبوون •

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو تەجرەبە کۆتا تەمەنە زۆر بەنرخ بوو • لەو ماوەیەدا بوو ڕۆژنامەی کوردی بۆ یەکەمین‌جار بە ئەنتەرتایپ‌و لاینۆتایپ لێ ئەدراو بەهۆی ئەوەوە کەرەستەیەکی زۆر لە لاپەڕەکانیدا کۆئەکرایەوە • ڕۆژنامەیەکی وەکو (ئازادی) ماوەیەکی تەمەنی هەفتەی سێ ژمارەو ماوەیەکیش هەفتەی دوو ژمارەی دەرئەکرد • (ژین) بۆ ماوەیەك بە لاپەڕەی گەورە دەرچوو • ماوەیەکیش هەفتەی دوو ژمارەی بڵاوئەکردەوە • ڕۆژنامەی (خەبات) ژمارەی عەرەبی‌و کوردیی لێ

دەرئەچوو • لەگەڵ ئەو هەموو تەنگ‌و چەڵەمە زۆرانەشدا کە داوو دەزگای ڕژێمی جومهووری کە زوربەیان لە پاشماوە داخ‌لەدڵەکانی چەرخی ڕووخاوی پاشایەتی بوون ، ئەیانهێنانەڕێی ڕۆژنامە کوردی‌یەکان‌و بەتایبەتی ئەوانەیان کە ڕێبازی پێشکەوتخوازانەیان زەق بوو ، ئەم ڕۆژنامانە بە ڕێکوپێکی ئەگەیشتنە هەموو ناوچەکانی کوردستانی عێراق‌و بەڵکو ئەشپەڕینەوە بۆ ئەودیوی سنووروو ، کەم گەورەدێی کوردستان هەبوو خوێندەوارانی ئەم ڕۆژنامانەی تێدا نەبێ •

قۆناغی نوێی گەشەکردنی ڕۆژنامەنووسیی کوردی لە ساڵی ١٩٦٧ەوە دەست‌پێ‌ئەکا کە ئەوەبوو لەگەڵ دەرچوونی تەناخیدا بە عەرەبی (برایەتی)یش بە کوردی ، لەپێشا هەفتەی جارێ بە ٨ لاپەڕەی نیوقەوارەو پاشان هەموو ڕۆژێ بە دوو لاپەڕەی گەورە دەرئەچوو • ئەم ڕۆژنامە کوردی‌یە هەم لە ڕووی سیاسی‌یەوە دەورێکی گەورەی لە بڵاوکردنەوەی هوشیاریی نەتەوەیی‌و دیموکراتیدا گێڕا ، نەك هەروەك ڕۆژنامەیەکی کوردستانی بەڵکو وەکو ڕۆژنامەیەکی عێراقی‌یش بە کوردی • هەم لە ڕووی تەکنیکی‌یشەوە هەنگاوێکی گەورە بوو بۆپێشەوە چونکە بە ڕێکوپێکی دەرئەچوو و ماوەیەکیش وەك هەر ڕۆژنامەیەکی عەرەبی قەوارەیەکی گەورەی هەبوو •

قۆناغی خۆئامادەکردن بۆ دەرکردنی بەیانی ١١ی مارت گوڕێکی تازەی بە ڕۆژنامەنووسیی کوردی دا • بۆ یەکەمین‌جار لە مێژووی عیراقدا ڕۆژنامەیێکی ڕێکوپێکی هەفتانەی کوردی لەسەر ئەرکی میری دەرچوو کە ڕۆژنامەنووسەکانی لەبەرئەوەی لای میری کاریان‌ئەکرد ترسی نان‌بڕانیان نەبوو و لەگەڵ ئەوەشدا تا ڕادەیەك توانای بە ئازادی دەربڕینی بیرو ڕای تێدا هەبوو • ئەم ڕۆژنامەیە ڕۆژنامەی (هاوکاری)

بوو کــه ئیستاش هەیەو ، مەودایەکی باشی خزمەتی زمان‌و ئەدەبمانە • لەگەڵ بوونی (هاوکاری)دا دەرچوونەوەی (برایی)و پاشان دەرچوونی (بیری نوێ)یش بە کوردی ، کارێکیان کرد سالانی ۷۲ ـ ۱۹۷۳ شــا ساڵی ڕۆژنامەی کوردی بن لە عێراقدا • لە ڕووی سیاسی‌یەوە هــەرکام لــەم ڕۆژنامانە توێژێــکی بیروباوەڕی ناو کۆمــەڵی کوردەواری‌یان دەرتبوە خۆیان • لــە ڕووی تواناشـــەوە هیچ‌کامیان ڕۆژنامەیەکی بازرگانی نەبوون تا پشتیان بە یەك دوو کەس قایم بێ ، داوو دەزگایەکی زلیان لەپشتەوە بوو • باری تایبەتیی ناو کۆمــەڵ‌و جۆری دەستەبەندیی هێزیش مەیدانی ئازادی‌یەکی ئاوادەیەك زۆری بیــری خولقاندبوو • بەدەوری ئەم سێ ڕۆژنامەیەدا کۆمــەڵێك گۆڤــاری جۆربەجۆریش هەبوون بــە هەموویانەوە هێزێــکی گــەورە بوون بۆ کــوردو بۆ ڕۆژنامەنووسیی دیموکراتی •

کشمان‌و پاشەکشە هەمیشە بووەو هەر ئەشبێ • مـــن لێرەدا لەتوانامدا نی‌یە زۆر درێژە بە هەڵسەنگاندنی باری مێژوو بدەم لە نیگای ڕۆژنامە نووسی‌یەوە کە لەو مێژووەوە تا ئیستا چی ڕوویداوەو چۆن بووە ، بەڵام ئەبێ بڵێین لە سەرەتای ۱۹۷٤ەوە وەرزی پاشەکشـــەی گەشەکردنی ڕۆژنامەنووسیی کوردی دەستی‌پێ‌کردووەو ئیستاش هێشتا لەگەڵ گەشەکردنی تەکنیــکی‌و دەرچوونی (هاوکــاری)و (بەیان)و (ڕۆشنبیری نوێ)و پاشبەندی (عێراق)و (ئۆتۆنۆمی)و ئیستاش (کاروان)دا هــەر نەبڕاوەتەوە •

تەکنیکی ڕۆژنامەنووسیی کوردی پێش‌کەوتووە ، ئەمە ڕاستە • بەڵام ئەشتوانرا گەلێ لەپێشتر بێ • ئیستاش لە دوو سێ تەکنیکیی کورد زیاتر لە بەردەستدا نی‌یە کە لــە چاپخانە نەك هەرە تازەکان ، بەڵکو

تەنانەت لـــە چاپخانە مامناوەندی‌یەکاندا کاربـــکەن • ڕۆژنامەنووسی ئەمڕۆ لەســـەر بناغەی حەزی خۆی‌و لەسەر بناغەی کارامەیی دانانرێ ، کـــەچی ڕۆژنامە نووسیی لە خودی خۆیدا جـــۆرە دڵداری‌یەکی کارەکەیە ، هـــەموو کۆسپ‌و تەگەرەیەك لەڕێی ڕۆژنامەنووسدا تەخت‌و ئاسان ئەکا • ڕۆژنامە نووسێ کـــە بە سۆزەوە بۆ کارەکەی هـــاتبێتە مەیدان ، لەگـــەڵ هـــەزار دیوارو شوورەی زەبروزەنـگ‌و تۆقاندنی ڕژێمیشدا ڕستەی‌وا ئەدۆزێتەوە چەردەیەك بیرو خولیای دڵ‌و دەروونی خۆی تێدا دەربڕێ • ئەمەی کـــە وتم واناگەیەنێ ڕۆژنامەنووسەکانی ئەمڕۆمان حـــەزیان لـــە کارەکەیان نی‌یە ، بەڵـکو مـــەبەستم ئەوەیە کارامەو لێ‌هاتووەکانیشیان زوربەیان هەر ڕێکەوتی ژیان خستوونیـــەتە ســـەر ئەم ڕێگا • ڕۆژنامەنووسی ڕاستەقینە هـــەزار کون‌و کەلەبـــەر ئەپشکنێ بۆ هەواڵێك ، بۆ پەردە لەڕوولادانی ڕازێ ، هەزار فێڵ‌و فەرەج ئەدۆزێتەوە بۆ وەدەستهێنانی هـــەل بۆ دەربڕینی ڕایەك ، نووسینی وتارێ •• چاپخانە بەجێ‌ناهێڵێ تا یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەکەی لـــە مەکینەی چاپ دەرئەچێ‌و ئەمدیوو ئەودیوی ئەکاو بە چاوی دایکێ بۆی ئەڕوانێ کـــە منالی نۆسکەی لە یەکەم کاتەکانی پاش لەدایك‌بوونیـــدا بەدەستیەوە ئەگرێ •• ئەمڕۆ لەبەرئەوە کـــە ڕۆژنامە هەمووی هیی میری‌یەو ، ئەمەش لە کۆمەڵێکی فرە ـ چین‌دا تەنها ئەنجامێك بەدەستەوە ئەدا کـــە ئەویش قۆرخ‌کردنی توانای بیروڕا دەربڕینە بۆ کۆمەڵێك‌و بێ‌بەش‌کردنی کۆمەڵانێکی تری زۆرە‌و ، تاقە کۆمەڵێکیش لە کۆمەڵگای فرەچینـــدا هەرگیز ناتوانێ‌و نایەوێ دڵ‌و دەروونی خـــۆی ئەوەندە فراوان‌و بەربڵاو بکا بێ‌سڵ‌کردنەوە گوێ لـــە بیرو ڕای کەسانی‌تریش بگرێ کـــە لەوانەیە وەك ئەو بیر نەکەنەوە ـ بەڵێ لەبەر ئەم هۆیـــە ناتوانین بڵێین کوردستان ڕۆژنامەی بەڕاستی ئازادبیری تیایە • تەنانەت

لـــه مەیدانی ئەدەبیشدا ئەو چەند ڕۆژنامەو گۆڤارە کــە هەن ، ناتوانن هەمو بیروڕاو ڕێبازە ئەدەبی‌یەکانی ناو کۆمەڵەی کوردەواری لە دەوری خۆیان خڕبکەنەوە • هـــەر لەبەرئەوەی کە ڕۆژنامەنووسان ، گەورەو بچووکیان ، وەك هـــەر مووچەخۆرێکی‌تری میری دائەمەزرێنرێن ، گەلێجار ئەبینین قەڵەمی نەك هەر لە ڕووی هونەری ، بەڵکو لـە ڕووی سیاسی‌یشەوە لێ‌نەهاتوو بەناو ڕۆژنامەو گۆڤارەکانا تەراتێن ئەکـەن‌و ، بنووسی بێ‌کارەی لاوەکی‌یش کە لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانا کار ناکـــەن بـەڵام تیایاندا هاوبەشن‌و ئەنووسن ، لەسـایەی سـەری هەڵسـەنگاندنی چەوت‌و چـــەوێڵی ئەوانەوە ڕێ‌یان ئەکەوێتە مەیدانی ڕۆژنامەنووسی‌و شوێنێکی زۆری بە ناهەق تێدا داگیر ئەکەن •

هەڵەی چاپ ئەمڕۆ بووە بـــە دەردێـکی کوشندەی سەرانسەری ڕۆژنامەو گۆڤارەکان • بە دەگمەن وتاری‌وات بەرچاو ئەکەوێ هەڵـەی لە سنوورێکدا بێ سەر لە خوێندەوار تێک‌نەدا • ئەم هەڵـــە زۆری‌یە نیشانەی ئەوەیە زۆر لە بنووسەکانیش‌و ڕۆژنامەنووسەکانیش بنووس‌و ڕۆژنامەنووسی ڕاستەقینە نین • ئەوان پاداش خۆرو ئەمان مووچەخۆرن• کەسیان دڵیان بە کاری ڕاستەقینەی ڕۆژنامەنووسی ناسووتێ ، بۆیەشـە هەنگاوێ بۆ چارەکردنی ئەم دەردە نانرێ •

لە چەرخی پاشایەتیدا کە بە شایەتیی هەموان لە ڕووی سیاسی‌یەوە نۆکەری ئیمپریالیزم‌و لە ڕووی کۆمەڵایەتی‌یەوە نوێنـەرو داردەسـتی دەرەبەگی‌و بۆرژوای مفتەخۆر بوو ، کوردستانی عێراق ، لە سلێمانی ( ژین ) و لە هـەولێر ( هـەتاو ) یکی تێـدابوو • کـەچی ئێستا پاش تێپەڕبوونی نزیکەی چارەکە سەدەیەك بەسەر شۆڕشی تەممووزی ١٩٥٨دا کە ئەو چەرخە نۆکەرو داردەستەی ئیمپریالیزم‌و دەرەبەگی‌و بۆرژوای مفتەخۆری ڕووخاند ، هەموو کوردستان تەنها گۆڤارێکی ( ئۆتۆنۆمی )ی

تیایە کە ڕاستتر ئەوەیە بڵێین تائێستا لە مەحزەر جەلسە چووە تا لە گۆڤار•
وا تازە ( کاروان ) یشی تێدا ئەکەوێتە ڕێو بەدڵ ئاواتـەخوازم ڕێـگای
تەختان بێو کەندو کۆسپی نەیەتەڕێ تا قاچی هەڵنەکەوێ ، کەچی لقێکی
نەقابەی ڕۆژنامە نووسانیشی تیایـە کە ئەوەتـە ئـەم کـۆڕەی بۆ ئامادە
کردووین •

ئەگەر لێم نەگرن و ئەو پەندی پێشینانەی کوردمان لەیادنەچێ کـە
ئەڵێ : « دۆستت ئەوەیە ئەتگرێنێ ، دۆژمنت ئەوەیە پێت ئەکەنێنێ » ، یا
ئەوەی عەرەب کە ئەڵێ : « صدیقك من صدقك ، لا من صدقك » واتە :
«دوستت ئەوەیە قسەی ڕاستت بۆ ئەکا نەك ئەوەیە کە هەرچی بڵێیت ئەڵێ
بەڵێ » ، ئەبێ بڵێم شوورەیی‌یە هێشتا لە کوردستاندا چاپخانەیەکی میری
نەکەوتبێتەکار بتوانرێ ڕۆژنامەو گۆڤارێکی تێدا لەچاپ بدرێ ، سەرمایەی
خۆماڵیش تا موقاوەلات بەپێوەبێ توخنی پرۆژەیەکی شارستانەتی‌یانەی
وەك دانانی چاپخانەیەکی لەمچەشنە نەکەوێ ، یا قازانجی خۆی تێـدا
بەدی نەکا •• مەنتیقی نی‌یە ڕۆژنامەیەکی وەك هاوکاری کە ڕۆژنامەی
دەوڵەت خۆیەتی‌و کارگـێڕەکانی هەموو کاربەدەستی میرین‌و ، بێ چەند
جار شەن‌وکەو کردن‌و بە زەڕەبین خوێندنەوە وتارێکی ئەدەبیی تێدا بڵاو
ناکرێتەوە ، هێشتا ئیمتیازەکەی ئیمتیازی ڕۆژنامەیەکی سیاسی نی‌یە •

بۆیە ، پێشنیهادم لە بارو دۆخی ئەمڕۆداو ئەوەندەی ئەمڕۆ توانای
جێبەجێ کردنی هەبێ ، ئەوەتە ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەی سیاسی هەر هیچ
نەبێ چوار لاپەڕەیی لە هەولێر بڵاوبکرێتەوەو ، لە هەرکام لە سلێمانی‌و
دهۆکیش مەیدانی دەرکردنی ڕۆژنامەیەکی هەفتانەی ئەدەبی‌و هەمەجۆر
بدرێ •• کارێك بکرێ بـە نزیکترین وەخت چاپخانـەی ئەمینداریتیی
ڕۆشنبیری‌و لاوان بخرێتەکارو هێڵی تایبەتیی بۆ لەچاپدانی ڕۆژنامـەو
گۆڤارو کتێبی بڕگەی تایبەتی ، زیاد لە هیی ئەمینداریتیی ڕۆشـنبیری‌و

لاوان خۆی ، تێدا دابمەزرێنرێ • بایەخێکی تایبەتی بە کۆکردنەوەی کادری لێهاتوو بۆ ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی میری‌و دوور خستنەوەی کەسانی لە ڕووی هونەری‌و سیاسی‌یەوە بوودەڵە بدرێ • لە هەموو ڕۆژنامەو گۆڤارەکانا سەرپەرشتی‌کەری زمانەوانی دامەزرێنرێ‌و کەسانی‌وا بن کۆمەڵەی کوردەواری وەك کوردی‌زان‌و زمانەوان ناسیبنی • لای کەمی یەکێتیی پێنووس لەو ڕۆژنامەو گۆڤارانەدا ڕەچاو بکرێ • ڕادەیەك دانرێ بۆ تەشەنەکردنی هەڵەی چاپ • هەوڵ بدرێ ئەوانەی دەمێ ساڵە جێ‌پەنجەیان بە ژیانی ڕۆژنامەنووسی‌و کولتووریمانەوە دیارەو ئێستە دوورەپەرێزن بهێنرێنەوە مەیدان • بۆ ئەمەش پێویستە ڕادەیەکی دڵسۆزانە بۆ ئەم تەنگەچیکڵدانی‌یەی ئێستا دانرێ کە لەئاست بیری ئازاددا لە هەمووولایەکدا لەتام دەرچووە •• با ڕۆژنامە لەوە بکەوێ کە لەئاست تەنگ‌و چەڵەمەو گیروگرفتەکانی ژیانی کۆمەڵانی خەڵك‌و بەتایبەتی ڕەنجکێشاندا ، دەمی بەسترابێ •• با کە خەڵك شکاتێکیان لا کرد ، بۆیان بڵاوبکاتەوە •• با پەیامنێرەکانی بچنە ناو خەڵك‌و ئاگاداری دەردو ئازاریان بن‌و لەبارەیانەوە بنووسن •• با کە کاربەدەستێك وەڵامێکی دایەوەو ڕۆژنامە بۆی دەرکەوت ڕاستناکا ، بوێرێ بەرپەرچی بداتەوە •• با ئەگەر پێشنیهادێکی بەجێی لە کەسێکەوە بۆ هات نەترسێ بڵاوی بکاتەوە •• با لە مەیدانی بیرو ئەدەبدا ئاسۆی تۆزێ فراوان بێ‌و ڕێ‌بدا لە باخچەی نیشتماندا هەزار جۆرە گوڵ بپشکوێ •• ئەم جیهانە تەنها یەك ڕەنگی تێدا نی‌یەو خەڵکیش بە کەل‌وپەل‌و جل‌وبەرگی یەك ڕەنگ قنیات ناکەن‌و داناکەون • هەر ئەمەیە ڕێگای ڕاستی پێشکەوتنی گەل‌و وڵاتو ، هەر ئەو گەلە ئەتوانێ داکۆکی لە وڵات بکاو ڕێ لە دوژمن‌و داگیرکەر بگرێ کە دڵی بە جۆری ژیانی خۆی خۆش بێ‌و بتوانێ ناتەواوی‌یەکانی دەستنیشان بکا ، تا بزانێ چۆنیان چارئەکا •

# الكلمة التي القاها الدكتور عزالدين مصطفى رسول في المؤتمر الاول للاتحاد العام للادباء والكتاب في القطر العراقي

السـيد رئيس المؤتمر
الاخوة والاخوات أعضاء المؤتمر

باسمي وباسم الادباء الاكراد الذين انضموا الى الاتحــاد العام للادباء والكتاب في القطر العراقي ، من حضر منهم المؤتمر ومن لم يحضر ، احيي اجتماعنا هذا وآمل من اعماق قلبي ان يتمخض عن اتحــاد رصين متين للادباء والكتاب العراقيين عربا وكردا وسواهم ، على اسس تقدميــة راسخة تحقق للجميع مطمحهم النبيل في النهوض بالحركــة الادبيــة والثقافية لقوميات العراق جميعها في ظل التآخي الوطيد والوحدة الوطنيــة الصلبة والشاملة •

ايها الاخوة والاخوات !

لا اريد ان اعود بكم الى الماضي حيث كانت المداولات ما تزال تجرى لضم الادباء والكتاب الاكراد لهذا الاتحاد وكان البحث ما يزال قائمــا عن افضل السبل لتحقيق مطاليبهم في اطــاره • ولا اريد كذلك ان اذكركم بتفاصيل الاجتماع الواسع الذي عقد في اربيل في النصف الاول من كانون

الثاني ١٩٨٣ والذي حضره الاستاذ عبدالامير معله ممثلا للهيئة التأسيسية للاتحاد العام للادباء والكتاب في القطر ، كما لا أبتغي ان اتلو عليكم الرسالة التي وجهها ذلك الاجتماع الى الهيئة ، ولكني ارى لزاما علي ان انوه بالفقرة التي وردت في تلك الرسالة والتي عبر فيها الادباء الاكراد عن اعتزازهم الشديد باتحادهم اتحاد الادباء الاكراد ، وتمنوا لو ان الرأى الرسمي كان الى جانب وجود منظمات ادبية عديدة تجمع شمل ادباء القطر ويوحدها جميعا اتحاد عام ينسق نشاطاتهم واعمالهم • ومع ذلك فقد اعلنوا عن استعدادهم للانضمام الى هذا الاتحاد ما دام ينظر اليه على انه افضل الطرق الى وحدة الادباء في القطر ، والوحدة مطمح الجميع •

كما ارى لزاما علي ان اذكر امامكم ما طلبه اولئك الادباء كضرورة لا غنى عنها لانتمائهم الى هذا الاتحاد واستمرارهم في العمل في صفوفه ، الا وهو :

اولا ـ حذف القيد المتعلق بمسقط الرأس والوارد في تعديل قانون الاتحاد العام للادباء والكتاب ليتاح لكل اديب كردي حيثما كان مسقط رأسه من وطننا العراقي الانتماء الى فرع الاتحاد الذي سيؤسس في منطقة الحكم الذاتي لكردستان •

ثانيا ـ النص في القانون على وجود نائب اول كردي للامين العام للاتحاد وسبعة اعضاء اكراد في المجلس المركزي للاتحاد تنتخبهم الهيئة العامة لفرع منطقة الحكم الذاتي ونسبة مماثلة منتخبة كذلك للمكتب الثقافي ، اضافة الى التمثيل في المكتب التنفيذي وهيئات الاتحاد المركزية الاخرى •

ثالثا ـ ذكر الاكراد الى جانب العرب في المجالات المتعلقة بعمل الاتحاد والتي ورد فيها ذكر العرب في القانون •

اننا اذ نعيد الى اذهانكم هذه المطالب المشروعة ، نرجو ان يرفع المؤتمر توصية بتحقيقها الى الجهات المختصة تحقيقا لما اجمع على طلبه الادباء الاكراد في اجتماع اربيل وتنفيذا للوعد الذي قطعته الهيئة التأسيسية للاتحاد على نفسها في رسالتها الجوابية التي بعثتها الى الادباء الاكراد بهذا الشأن والتي جاء فيها انه «يتم طرح طلباتهم على المؤتمر العام لتأخذ صيغة اجماعه ومن ثم تؤخذ الاجراءات لتنفيذها كل وفق ما يتطلبه من اجراء على شكل تعديل للقانون ام تضمين في النظام الداخلي للاتحاد ام على شكل تعليمات داخلية » .

ان توصية اجماعية منكم ، ايها الاخوة والاخوات ، بتحقيق هذه الطلبات ، رغم ان ما يمكن تحقيقه منها من قبل المؤتمر تقرر تحقيقه فعلا ، انما يعزز الثقة المتبادلة ، ويعطي بشائر مستقبل مجيد لاتحادنا المنشود . واننا لعلى ثقة من ان الاخوة العرب وسائر الاخوة يقفون دوما الى جانب ما يرونه حقا لنا او لغيرنا ، وانهم ليسوا اقل منا حرصا على تحقيق مطالبنا وازالة كل عثرة على طريق عملنا الموحد . والسلام عليكم .

# كتاب من محافظة بغداد
# بشأن اتحاد الادباء الاكراد

**الجمهورية العراقية**
**محافظة بغداد**
**مديرية الشؤون الداخلية**
**الجمعيات**

**العدد / ١٧٩٨**
**التاريخ ١٩٨٣/٨/٩**

الى / جمعية ـ اتحاد الادباء الاكراد
نادي ـ

م / فك ارتباط جمعيات واتحادات

بالنظر لتماثل اهداف جمعيتكم / اتحادكم مع اهداف الاتحاد العام للادباء والكتاب في القطر العراقي •• عليه قررت وزارة الداخلية بكتابها ٨٠٦٦١ في ١٩٨٣/٨/١ فك ارتباط جمعيتكم / اتحادكم من قانون الجمعيات رقم ( ١ ) لسنة ١٩٦٠ المعدل ونقل كافة موجوداتكم والتزاماتكم الى الاتحاد المذكور وذلك استنادا الى احكام الفقرة ( أ ) من ( اولا ) من المادة ( ٢٧ ) من قانون الاتحاد رقم ٧٠ لسنة ١٩٨٠ لاتخاذ ما يلزم بصدد الموضوع رجاء •

عبد الجليل الياسري
ع / محافظ بغداد

# پێرست

# « الكاتب الكردي »

مجلة « نووسەری کورد »

مجلة اتحاد الادباء الاكراد في العراق

العـدد ( ١٢ ) ، الدورة الثانيـة ، آب ١٩٨٣

رئيس التحريـر

الدكتـور عزالدين مصطفى رسـول

سكرتـير التحرير

ممتـاز الحيدري

الادارة

بغـداد ـ الوزيريـة

مقـابل كلية التربية الرياضيـة ـ مقر جمعية الثقافة الكردية

# THE KURDISH WRITER

BULLETIN OF
THE UNION OF THE KURDISH WRITERS IN IRAQ

No. ( 12 ) Second Period, August 1983

EDITOR - IN - CHIEF :
Proffesor - Ds. C. : IZZADIN MUSTAFA RASOOL

DEPUTY EDITOR - IN - CHIEF :
MUMTAZ HAYDARI

Office : BAGHDAD, WAZEERIYYAH, OPPOSITE COLLEGE OF PHYSICAL EDUCATION, HEADQUARTERS OF THE KURDISH CULTURAL SOCIETY.